


# تێگەشتنی سَلَف بۆ دەقە شەرعیەکان

## لە ڕونکردنەوەی کاتی

# پارشێو و نوێژی بەیان

نووسینی :بدر خوڕماڵی



# تێگەشتنی سەلەف بۆ دەقە شەرعیەکان

## لە ڕوونکردنەوەی کاتی پارشێو و نوێژی بەیان



نوسینی

بدر خوڕماڵی

لە بلاو کراوەکانی کەناڵی تێلیگرام ( ئیسلام بەتێگەیشتنی سەلەف )

# پێرست

# بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله رب العالمين الرحمن الرحيم مالك يوم الدين ، اللّٰهُمَّ صل على حبيبنا محمد و على آله و صحبه وسلم تسليما كثيرا .

## موسڵمانی ئازیز بزانە :

هەموو چاکە و خێرێك و سەرفرازیەك لە شوێن کەوتنی سەلەفە : ئەو سێ سەدەیەی پێغەمبەر ﷺ وەسفیان دەکات و بە باشترینی ئوممەت ناویان دەبات وە چەندین ئایەت فەرموودەیان لە بارەوە هاتووە وە کۆدەنگی زانایان لەسەر ئەوەیە لە پێش هەموو ئوممەتەوەن.

وە هەموو خراپەیەك و گومڕاییەك لە وازهێنانە لە مەنهەجی سەلەف و گەڕانەوەیە بۆ خەلەف، بەتایبەتی ئەوانەی کە پێچەوانەی عەقیدەی سەلەفن و ئەو ڕێگەیەیان نەگرتووە کە ئەوان لەسەری بوون و بەڵکو خەریکی بیدعە و داهێنان بوون لە دیندا ، وە سەرەنجامیشیان بۆ ئاگری بڵێسەدارە نعوذ بالله منها.

الله هەموومان بپارێزێ لە ڕێگەی خەلەف و لەسەر شوێنکەوتنی سەلەف بین بمانمرێنێ و لەسەر ئەوە زیندوومان بکاتەوە لەگەڵ ئەوان و پێغەمبەر ﷺ حەشرمان بکات .

## چەند تێبینیەك :

دەربارەی هەندێ زاراوە و دەستەواژە هەوڵمداوە گونجاو ترین دەستەواژە دابنێم بۆ واتا کردنی وشەکان و نزیک ترینیان لە نێوان هەردوو زمانی عەربی و کوردیدا ئەگەر هەبووبێ.

بۆ نمونە وشەی (الخیط) دەستەواژەی (دەزوو)م بەکار هێناوە چونکە ئەگەر سەیری هاوەڵان بکەیت بەوە تێگەشتن، وە ڕاستە الخیط بۆ ڕەنگیش بەکار دێت بەڵام ئەبێ قرینة هەبێت بۆ ئەوە بڵێیت بۆ ڕەنگە وەک لە ئایەتەکە کە دەفەرمێ « من الفجر » کاتێک رسول الله ﷺ نکۆڵی نەکرد لە تێگەشتنی هاوەڵان لەوەی بە دەزوو تێگەشتوون بەڵکو نکۆڵی ئەوەی کرد کە بۆ سەرنجی هەموو ئایەتەکەتان نەداوە تاوەکو بزانن مەبەست لێ ڕەشایی شەو وڕووناکی ڕۆژە.

یان وەک ئەو ریوایەتەی دەڵێ سەرەتا « من الفجر » دانەبەزی بوو دواتر کە ئەوان بەو شێوەیە تێگەشتن الله ئەوەشی دابەزاند .

جا بۆیە منیش ئەگەر تەنها وشەی الخیط م بە جودا واتا کردبێ ئەوە دەزوو م وەک زاراوە بەکار هێناوە بەڵام کاتێک لە چوار چێوەی تەفسیر کردنی ئایەتە واتا مەبەستەکانم بەکار هێناوە.

### دوو زاراوەی گرنگ هەن کە زۆرجار کێشەیان لەسەر دروست ئەکرێت و ڕەنگە هەندێک بیکەن بە بەڵگە :

١- الغلس : ناوە بۆ کاتێک ئەویش واتە : تاریکی کۆتایی شەو کاتێک تێکەڵ دەبێ بە ڕووناکی ڕۆژ. ڕاستتر وایە لەم کاتەدا نوێژ بکرێت چونکە یەکەم کاتی نوێژ هاتووە وە فەرموودەی زۆری لەسەر هاتووە و **امام أبو بکر و عمر رضي الله عنهما** لەو کاتەدا کردوویانە .

أ - ئەو فەرموودەیەی کە ئافرەتانی باوەڕداران کە نوێژیان دەکرد و لەبەر تاریکی شەو یەکدیان نەدەناسیەوە دواتر ئەوە لەم کاتەدایە. دواتر فەرموودەکەمان هێناوە بۆیە لێرە تەنها ئاماژەیەکی پێ ئەدەم .

ب - « هاوەڵان» یان پێغەمبەر ﷺ نوێژی بەیانی دەکرد لەو کاتەدا .

**[صحيح البخاري : ٥٦٠ و مسلم : ٦٤٦]**

ج - وە هەموو ئەو فەرموودانەی دیکە کە هاتوون دەربارەی ئەوەی کە هاوەڵان یەکتریان نەدەناسیەوە هیچ بەڵگە نیە بۆ ئەوەی کە نوێژ پێش فەجر بکرێت چونکە لە دوای نوێژی شێوانەوە تاوەکو ڕووناک بوونەوەی دونیا جارێکی دیکە هەواو بەو شێوەیە تاریکە و گەر ڕووناکی کار پێ نەکرێت خەڵکی یەکدی ناناسنەوە .

٢- الاسفار : واتە کاتی تیشکدانەوەی ڕۆژ و ڕووناک بوونەوەی دونیا .

فەرموودەیەکمان هەیە :

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ : لە کاتی ڕووناک بوونەوەی دونیا نوێژ بکەن چونکە ئەوە گەورەترە « باشترە » بۆ پاداشت .

**[جامع الترمذي: ١٥٤ ]**

بڕوانە أبو عيسى الترمذي چی دەفەرمێ لەسەر فەرموودەکە : وە زیاتر لە یەکێک لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ پێیان وایە کە نوێژی بەیان بکرێت بە کاتی ڕووناک بوونەوەی دونیا. وە **سفيان الثوري وا دەڵێ ، وە الشافعي و أحمد و إسحاق دەڵێن : واتای الإسفار ئەوەیە کە فەجر دەربکەوێت تاوەکو گومانی تێدا نەمێنێت وا نابینین واتای الإسفار دواخستنی نوێژ بێت .**

**ووتم** : منیش هەمان شتم ووتوە لەم نامیلکەیە ئەویش ئەوەیە کە نوێژ بە هیچ شێوەیەک ناکرێت تاوەکو دڵنیا نەبیت لە هەڵهاتن و دەرکەوتنی بەیان وە بە هەمان شێوەش خواردن و خواردنەوە هتد.. بۆ کەسی ڕۆژووەوان حەڕام نابێت.

چەند شیکردنەوەیەکی دیکە کراوە بۆ فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ بۆ واتای الإسفار بەڵام لەبەر نا پێویستی نایهێنم تەنها ئاماژەی پێ ئەدەم .

لەوانە دەوترێ واتای فەرموودەکە ئەوەیە کە لە کاتی الغلس نوێژ دەستپێبکرێ و لە الإسفار کۆتایی پێ بهێنرێ واتە قورئانی زۆر تێدا بخوێندرێ و درێژ بکرێتەوە .

یان دەوترێ : بۆ هاوین کە شەو کورتە بۆ نوێژ خوێنان ڕەنگە نەگەن بە نوێژی بە کۆمەڵدا ئەگەر لە الغلس دا نوێژ بکرێ بۆیە باشتر وایە دوابخرێ بۆ الإسفار.

**ئاگادارایەك /** من ئاثاری هاوەڵان و شوێنکەوتووانیان واتە : ئەو شتانە لێیانەوە گوازراوەتەوە کە لێرە هێناومە مامەڵەی فەرموودەکانی پێغەمبەریان لەگەڵ ناکەم هەر وەک لای زانایانی فەرموودەش نەکراوە و ناکرێ بۆیە من ملزم نیم بەوەی مامەڵەی فەرموودەیان لەگەڵ بکرێت بۆ بە صحیح دانان و ضعیف دانانیان، بەڵکو مامەڵە کردن لە ڕووی وەرگرتنیان و ڕەدد کردنەوەیان کارئاسانی تێدا کراوە لای سەلەف.

پاشان من زۆرێک لە ریوایەتەکانم یان لە مصنف ابن أبي شيبة یاخود مصنف عبد الرزاق کە ئەوان قەبوڵیان کردووە بە نقڵ کردنیان وەرگرتووە مەگەر ریوایەتێک منکر بێت وە محققەکان هیچیان لەبارەوە نەوتووە .

وە ووتەکانی سەلەف پێچەوانەی ئایەتەکە نین ئەگەر سەنەدەکەشیان شتێکی تێدا بێت بەڵکو تەفسیری ئایەتەکە دەکەن و ڕوونکردنەوەی زیادەیە لەسەری و کارکردنە پێی بەمەش دەچێتە ژێر تێگەشتن و تەفسیر کردن و شەرح کردنی ئایەتەکە و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ جا یاخود بە کردار یاخود بە گوفتار بەو شێوەیەش ئاسانکاری و لێبوردەیی زۆر تێیدا فراوەنە لە بە دروست دانان و لاواز دانانی سەنەدەکان .

# پێشەکی

دینی الله بۆ بارگرانی بەسەر خەڵکیەوە نە نێردراوە، الله جل جلالە ئەفەرمێ ﴿ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ﴾ **[الحج: ٧٨]** واتە : الله جل جلالە شتێکی لەسەرتان دانەناوە لە دین کە قورسی و تەنگی بێت بۆتان .

وە دەفەرمێ ﴿ يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ ﴾ **[البقرة ١٨٥]**

واتە : الله عز وجل نەرمی و ئاسانی ئەوێت بۆتان و نایەوێت لێتان تەنگ بکاتەوە قورسی بکات لەسەرتان.

الله جل جلالە ئەو دینەی ناردووە بە پێغەمبەردا ﷺ چۆن تەوحیدی بە شەرعی خۆی ناساندووە بە هامان شێوەش ئاسانکاری بە شەرعی خۆی ناساندووە بە مەرجێک پێچەوانەی دەقێکی شەرعی دیکە نەبێت و فەرمانەکان و قەدەغەکراوەکانی الله دەستکاری نەکرێن.

وەک **رسول الله** ﷺ دەفەرمێ :

أحب الدين إلى الله الحنيفية السمحة.

واتە : خۆشەویست ترین دین لە لای الله تەنها الله پەرستیە و نەرمی و ئاسانیە.

**[صحيح البخاري : ٣٩]**

الله سبحانە وتعالی نایەوێت قورسی بخاتە سەر شانی بەندەکانی بەڵکو دەیەوێت لەسەریانی لابەرێت و فراوانی و ئاسانی بهێنێت بۆ بەندەکانی.

جا یەکێک لەو باسانەی الله بە شەرعی داناوە بەبابەتی پارشێو کردن و بەربانگ کردنەوەیە کە فەرمانی کردووە بەربانگ زوو بکرێتەوە و پارێشو درەنگ بکرێت ،

جا ئێستە کاتەکەی دیاری کراوە خەڵکی بە پێی کاتژمێری ئەلیکترۆنی کە چەند ساڵێکە دانراوە و خەڵکی لەسەری دەڕوات بە پێی ئەوە بانگ دەدرێت و پارشێو زوو دەکرێت و بەربانگ درەنگ دەکرێتەوە و پابەندیەکی زۆر ڕژد دەبینرێ بەو کاتە دەستکردەوە کە زۆر دوورە لە قورئان و سوننەت و مەنهەجی سەلەف ەوە بگرە بە جۆرێک سەیر دەکرێت وەک ئەوەی الله ئایەتی دابەزاندبێت یان پێغەمبەری ناردبێت بۆ ئەوەی خەڵکی ئاگادار بکاتەوە لەو کاتە لانەدەن کە لەسەر ئەو کاتژمێرانە دیاری کراوە و پابەندبن پێیەوە.

جا منیش ویستم کەمێک پەردە لەسەر ئەو ئاثارە تۆز لەسەر نیشتوانەی سەلەف هەڵبماڵم کە چۆن پێچەوانەی ئەم سەردەمە جوڵاونەتەوە چەندێک پابەندی قورئان و سوننەت بوون و چۆن تێگەشتوون لەو داواکاریانەی الله تعالی.

# ڕوونکردنەوەی ڕێسایەك وەك پێشەكیەك بۆ تێگەشتن لە بابەتەكە

سەرەتا بە ڕێسایەک دەست پێدەکەم کە زانایان لە باسی ڕێسا فیقهیەکان باسی دەکەن و ڕێسایەکی زۆر گرنگ و پێویستە و زۆر باس وەک خۆی تێدەگەیت بە زانینی کە پێشتر بەو جۆرە لێی تێنەدەگەشتیت.

**ڕێساکە : الأصل البقاء ما كان على ما كان واليقين لا يزول بالشك بل لا يزول إلا بيقين.**

**واتە : لە بنەڕتدا چەسپاو بە چەسپاوی خۆی دەمێنێتەوە وەک چۆن بووە و دڵنیایی بە گومان ناڕوات بەڵکو بە دڵنیایی نەبێت ناڕوات « لاناچێت » .**

ئەمە یاسایەکی زۆر گرنگ و گەورەیە و بەردەوام کارمان تێی ئەکەوێت لە ژیانی ڕۆژانەماندا : ئەم ڕێسایە وەرگیراوە لە فەرموودەی پێغەمبەرەوە ﷺ کە ئەفەرمێ : نوێژەکەت مەبڕە تاوەکو بۆنێک هەڵئەمژیت یاخود دەنگێک دەبیستی.

لە زاراوەی شەرعدا تاوەکو **« الحدث الأصغر »** دێت بە سەرتدا ، واتە : تاوەکو دەستنوێژت ئەشکێت بەبێ تەڕی ، وە تەنها لە ڕێی دواوە ئەشکێت.

بنچینەی ئەم ڕێسایە لەسەر ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کاتێک پیاوێک پرسیاری لێ ئەکات و ئەڵێ : گومانم هەیە لەوەی دەستنوێژم شکا بێت ، ئەویش بەو شێوە فەرمانی پێ ئەکات کە ووتمان.

مەفهومی ئەو ڕێسایە ئەوەیە کە : مادام حاڵەتێک و شتێک سەلمێنرا بێت ئەو سەلمێندراوە لاناچێت تاوەکو شتێک هێندەی سەلمێنراوەکە بەهێز نەبێت بێتە جێگەی سەلمێنراوەکەو لای ببات.

واتە بە جۆرێک حاڵەتێک یاخود شتێک کە لە بوونی خۆیدا مانەوەی تێدا بێت چەسپا بوو نەفی ناکرێت تاوەکو هەڵوەشێنەرەوەیەکی پەیدا دەبێت و دێتە جێگەی چەسپاوەکە ئەوکات نەفی جێگیر ئەبێت بۆ شتەکە و چەسپاوەکە هەڵدەگیرێت.

## نمونەیەک :

کەسێک موسڵمان ئەبێت بە دەربڕینی وشەی لا إله إلا الله یان نە ناسروایێک کە نوێژی لێ ئەبینرێ ئەمە موسڵمان ئەژمار ئەکرێت بە یەقینی و هیچ گومانێک نامێنێتەوە تێیدا وە تەنها بەو شایەتومان هێنانەی و نوێژ کردنەی لە بازنەی ئیسلام ئەمێنێتەوە تاوەکو کوفرێکی گەورەی ڕوون و ئاشکرای لێ ئەبینرێ ئەو کاتە ئیسلامەتیەکەی هەڵدەوەشێتەوە و بە موسڵمان ئەژمار ناکرێت لەوەو دوا ، پێش بینینی کوفرەکە لێی تۆ یەقینت هەیە کە موسڵمانە و ناتوانی تەکفیری بکەیت.

بە ئەگەر و ڕەنگە و گومان تەکفیر ناکرێ ئەگەر چی ئەگەری زۆر بەهێزیش هەبێت بۆ ئەوەی کە ئەشێ کوفری کردبێت چونکە تۆ یەقینت هەبووە کە موسڵمانە ئەبێ یەقینێکی دیکە هەبێت ڕێک پێچەوانەیکەی بسەلمێنێ ئەوکاتدروستەلە بازنەی ئیسلام دەربکرێت ، وە
ئیسلامەتیەکەی ماوە و بە بەردەوامی تاوەکو کوفری لێ بەدەر ئەکەوێ وە بۆ کافریش بە هەمان شێوە.

**بۆ تێگەشتنی زیاتر ئەڕۆمە ناو بابەتەکەی خۆمانەوە جوان سەرنج بدە تاوەکو لە باسەکە باش تێبگەیت :**

زانراوە کە شەو ڕۆژ بە دوای یەکدا دێن و شەو ڕۆژ دا ئەپۆشێت و ڕۆژ شەو ناهێڵێت ، الله جل جلالە ش فەرمانی کردووە مرۆڤ بە ڕۆژوو ببێت لە ڕۆژەوە بۆ شەو نەک لە شەوەوە بۆ شەو ، وە ڕۆژیش بە هاتنی کاتی نوێژی بەیانە ئەویش بە هەڵهاتنی « فجر الصادق » بەیانی ڕاستگۆ

بەڵگەشمان بۆ ئەم قسانە ئایەتی : ﴿ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ۖ ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى اللَّيْلِ ۚ ﴾ **[ البقره : ١٨٧ ]**

واتە : وە بخۆن و بخۆنەوە تاوەکو بۆتان ڕوون ئەبێتەوە سپیایی ڕۆژ لە ڕەشایی شەو جودا ئەکەنەوە پاشان درێژە بدەن بە ڕۆژووەکەتان و تەواوی بکەن تاوەکو شەو.

جا بنچینەی ئەم باسە لەسەر ئەم ئایەتە ئەسوڕێتەوە بە پشتگیری کردنی ئەو ئەثەرانەی لە سەلەفەوە هاتوون ،

**ئێستە مەفهومێکی باسکە گەشتووە با بڕۆینە ناوەوە زیاتر :**

پێش هەموو شتێک ئایەتەکە فەرمانی بە یەک شوێن و دوو شوێن نەکردووە بۆ نمونە کە ئەفەرمێ « حتی یتبین لکم » تاوەکو بۆتان ڕۆشن ئەبێتەوە ، مەبەستی کێیە لە ئێوە ؟؟

مەبەستی خەڵکی مەککەیە ؟ یاخود مەدینە ؟ یاخود شام ؟ یاخود یەمەن ؟ یاخود عێراق ؟

نا بەڵکو مەبەستی خەڵکی هەموو شوێنێکە لە لای خۆیان سەرنج بدەن و بڕوانن تاوەکو بۆیان ڕوون ئەبێتەوە ، بۆیە ناکرێ کەسێک لە شارێکی دیکە یان لە گوندێک بۆمان دیاری بکات بە کاتی خۆی کە کەی فجر الصادق هەلدێ ، الله فەرمانی کرد کە تاوەکو بۆ تۆ دەر ئەکەوێ ، نەیفەرموو برۆ بۆ گوندەکان و دەشتەکان بزانە لەوێ چ کاتێک هەڵدێ و دەر ئەکەوێ .

پاشان ئەمە ضبط ناکرێ بە ئاسانی چەند ڕۆژ ئەکەیتە پێوەر بۆ ئەوەی تەواو شتەکەت لێ دەر بکەوێ ؟؟ نەخێر ئەبێت ماوە نا ماوە بڕوانیت تاوەکو بزانیت چۆنە و کەی فەجر هەڵدێت و کەی ئاوا ئەبێت،

بەڵام من گرنگی بەوە ئەدەم کاتێک بانگی بەیانی ئەدرێت ئایا کاتی نوێژ هاتووە و ئەبێت مرۆڤ خۆی بگرێتەوە لە خواردن و خواردنەوە و نوێژەکەی بکات ؟

**نەخێر هەرگیز کاتی نەهاتووە بەڵکو زۆر زۆر کاتی ماوە**

با بگەڕێینەوە بۆ ڕێساکە :

ئێستە شتێک هاتۆتە پێش ئەویش گومانێکە ئایا کاتی شەو تەواو بووە و ڕۆژ هاتووە یاخود نا ؟ تۆ دڵنیایت لەوەی کە لە شەودایت تا ئەو کاتەی گومانەکەت بۆ پەیدا ئەبێت بەڵام بانگ ئەدات و گومانت بۆ پەیدا ئەبێت کە ڕەنگە فەجر هەڵهاتبێت بینا لەسەر ئەوەی بانگ دراوە ،

لێرە تۆ یەقینێکت هەیە کە بوونی شەوە لەگەڵ گومانێک کە ئەگەری هاتنی بەیانە ، تۆ ئەبێت واز بهێنیت لە گومانەکەت کە هاتنی بەرەبەیانە و ڕۆشتنی شەوە وە ئەبێت دەست بگریت بەشەوەوە کە دڵنیاییەکەیە چونکە ووتمان گومان دڵنیایی لا نابات بەڵکو دڵنیایی دڵنیایی لا ئەبات ،

تۆ وەک چۆن دڵنیایت لەوەی شەو هاتووە ئەبێت بەو شێوەیەش دڵنیا بیت لەوەی ڕۆژ هاتووە بۆ ئەوەی نوێژی خۆت بکەیت و دەست هەڵبگریت لە خواردن و خواردنەوە ، وە گەر نا تۆ پێچەوانەی شەرعت کردووە.

**پێش ئەوەی بڕۆمە سەر فەرمووده و ئەثەرەکان تێبینیەکی گرنگ بڵێم لەسەر فجر الصادق و فجر الكاذب :**

**فجر الكاذب** : پێش فجر الصادق هەڵدێت وە سەرەوە و ناوەڕاستی ئاسمانەوە پەیدا ئەبێت و کاتەکەی کەمێکە و نامێنێت بە زوویی ئەڕوات و کەمێک لە دونیا دائەپۆشێت شێوەی تیشکیە وەک کلکی گورگ.

**فجر الصادق** : لە دوای فجر الكاذب دێت وە لە سوچی ئاسمانەوە دەرئەکەوێت و ڕێگا ڕۆشن ئەکاتەوە و وردە وردە هەموو ئاسمان ڕووناک ئەبێتەوە پێی و لە سەرەتاوە لە سەر چیاکانەوە دەرئەکەوێت وە سوریی و سپی تێکەڵە.

## تەفسیری ئایەتەکە :

﴿ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ۖ ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى اللَّيْلِ ۚ ﴾ **[البقرة ١٨٧]**

١- **سهل بن سعد** ( ٨٨ هـ ) دەڵێ :

وەکاتێک ﴿ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ ﴾ دابەزی پیاوان گەر بیانویستایە بە ڕۆژوو بن یەکێکیان دەزوویەکی سپی و دەزوویەکی ڕەشی ئەبەست لە پێیەکانی بەردەوام ئەیخوارد تاوەکو ئەیبینین بۆی ڕوون ئەبووەوە ، جا الله « من الفجر » ی دا بەزاند ، پاشان زانیان کە مەبەست شەو و ڕۆژە.

**[ صحيح البخاري : ١٩١٧]**

**سهل بن سعد** دەڵێ :

کاتێک ئەم ئایەتە دابەزی : ﴿ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ ﴾ دەڵێ : پیاو دەزوویەکی سپی و دەزوویەکی ڕەشی بە دەستەوە دەگرت ، جا ئەیخوارد تاوەکو بۆی ڕوون ئەبوونەوە تاوەکو الله عز وجل { مِنَ الْفَجْرِ } ی دابەزاند ، جا ئەوەی ڕوون کردەوە.

**[صحيح مسلم : ١٠٩١]**

٢- **عـدي بـن حـاتـم** ( ٦٨ هـ ) دەڵێ :

هاتم بۆ لای رسول الله ﷺ ئیسلامی فێر کردم وە نوێژەکانی بۆ وەسف کردم کە چۆن بیانکەم هەموو نوێژێک لە کاتی خۆیدا ، پاشان فەرمووی : ئەگەر رمضان هات ئەوە بخۆو بخۆرەوە تاوەکو بۆت ڕوون ئەبێتەوە دەزووی سپی لە دەزووی ڕەش « ڕووناکی ڕۆژ لە تاریکی شەو » ی بەیان پاشان ڕۆژووەکەت تەواو بکە تاوەکو شەو.

منیش نەمزانی ئەوە چییە ، دوو دەزووم بەست لە پێم لە ڕەش و سپی کاتی بەیان بۆم ڕوانین بینیمن یەکسان هاتم بۆ لای رسول الله ﷺ ووتم : ئەی پێغەمبەری الله هەموو ئەوانەی وەسیەتت بۆ کردم پێیان پاراستمن ، جگە لە دەزووی سپی لە دەزووی ڕەش

فەرمووی : چی ڕێگری لێ کردووی ئەی ابن حاتم ؟ وە بزەی کرد وەک بڵێی زانی چیم کردووە

ووتم : دەزوویەکی سپی و ڕەشم بەستووە ، شەو سەیرم کردن بینیمن یەکسانن

جا پێکەنی تاوەکو خرێیەکانی دەرکەوتن ، پاشان فەرمووی : ئەی پێم نەگوتی لە بەیاندا ؟ ئەوە ڕووناکی ڕۆژە لە تاریکی شەو

**[صحيح البخاري : ٤٥١٠] - [تفسير الطبري : ٣/ ٢٥٠ – ٢٥١]**

**عـدي بـن حـاتـم** رضي الله عنه دەڵێ :

کاتێک ﴿ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ﴾ دابەزی ، عدي بن حاتم ووتی بە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم : ئەی پێغەمبەری الله من لە دوو عقال دەخەمە ژێر سەرینەکەم ، عقال ێکی سپی و عقال ێکی ڕەش ، تاوەکو شەو لە ڕۆژ جودا بکەمەوە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پێی فەرموو : تۆ سەرینەکەت پان و بەرینە « فراوانە » ، ئەوە تەنها ڕەشایی شەوە و سپێتی ڕۆژە. **صحيح مسلم : ١٠٩٠]**

**عقال : ئەو گوریسەیە کە وشتری پێ دەبەسترێتەوە ، یان لاقی پێ دەبەسترێت .**

**ووتم** : ریوایەتی دیکە زۆر هاتووە لە هاوەڵانەوە بە دەربڕینی جیاواز بەڵام من ئەوەندە ئەهێنم کە مەبەست بگات بە خوێنەر و تێگەشتنی ئاسان بکات.

٣ - لە ***زر بن حبيش*** (٨١ هـ) ەوە دەڵێ :

**حذيفة** « بن اليمان » فەرمووی : رسول الله ﷺ پارشێوی ئەکرد وە من جێگە تیرەکانم ئەبینی ، ووتی : ئایا دوای بەیان ؟ فەرمووی : خودی بەیان بوو بەڵام ئەوەندە هەبووخۆرهەڵنەهاتبوو.

**[تفسير ابن جرير الطبري : ٣ / ٢٥٨]**

بڕوانە واتە دونیا هێندە ڕووناک ببویەوە تاریک تاریک نەبوو هیچ دیار نەبێت

٤ - ***إبراهيم التيمي*** ( ٩٢ هـ ) دەڵێ :

باوکم لەگەڵ **حذيفة** « بن اليمان » گەشتی کرد، ووتی : جا ڕۆشت تاوەکو ترساین لە پڕ بەیانمان لێ هەڵبێت، فەرمووی « واتە : حذيفة » هیچ یەکێک لە ئێوە ئەخوات یان ئەخواتەوە ؟

پێم ووت : ئەگەر یەکێک بیەوێ بەڕۆژوو ببێت نەخێر

فەرمووی : بەڵکو بەخێر ، پاشان ڕۆشت تاوەکو بینیمان هێواش بووینەوە بۆ نوێژ ، جا پارشێوی کرد.

[ تفسير ابن جرير الطبري : ٣ / ٢٥٧]

**بڕوانە چەندێک دوای ئەوەی کە ئەوە باوەڕیان وابوو کاتی پارشێو نەماوە.**

٥ - **ابن عباس** ( ٦٨ هـ ) (رضي الله عنه) دەفەرمێ :

« الخيط الأبيض من خيط الأسود » واتە : شەو لە ڕۆژ کۆبوونەوە « لەگەڵ خێزان » و خواردن و خواردنەوەی حەڵاڵ کردووە **تاوەکو بەیانتان بۆ ڕوون ئەبێتەوە** ئەگەر بەیان ڕوون بوویەوە ئەوە کۆبوونەوە « لەگەڵ خێزان » و خواردن و خواردنەوە حەڕام کراوە تاوەکو ڕۆژووەکە تەواو ئەکەن بۆ شەو ، فەرمانی کردووە بە بە ڕۆژووی ڕۆژ بۆ شەو وە فەرمانی کردووە بە ڕۆژوو شکاندن لە شەودا.

**سەرنج بدە لە قسەکەی ابن عباس فەرمایشتی الله جل جلاله دڵنیا ئەکاتەوە زیاتر کە ئەفەرمێ : بۆتان ڕوون ئەبێتەوە :**

**خاڵی یەکەم** : واتە بۆ ئێوە ، ئەوانەی کە ئەتانەوێ بە ڕۆژوو بن ، واتای ئەوەیە بۆ ئەو شوێنەی کە لێی نیشتنە جێن یان لە هەر شوێنێکی دیکەن.

**خاڵی دووەم** : ئەفەرمێ : بۆتان ڕوون بوویەوە ئەوکات حەڕام ئەبێت واتە : دڵنیا ببنەوە لە تەواو بوونی شەو نەوەک شتێک لە دڵتان مابێت و بە گومان بن لەوە شەو تەواو بووە یاخود نا ، نەخێر بەڵکو ئیدی هیچ لێڵیەک نەماوە بۆ ئەوەی بڵێن ڕەنگە شەو هێشتا مابێت.

**خاڵی سێیەم** : دڵنیاییە بۆ خاڵی دووەم ، ابن عباس ئەفەرمێ : الله سبحانه وتعالى فەرمانی کردووە بە ڕۆژووی ڕۆژ بۆ شەو ، واتە ئەوکاتەی تۆ دەستت لە خواردن و خواردنەوە هەڵگرتووە

و بەیان نەهاتووە تۆ هێشتا بە ڕۆژوو نیت ، وە ڕۆژوو لەشەوەوە بۆ شەو نیە لە ڕۆژەوە بۆ شەوە .« لەوە تێبگەن »

٦ - تابعي بەڕێز **الحسن البصري** ( ١١٠ هـ ) :

**« حتى يتبين لكم الخيط الأبيض من خيط الأسود من الفجر » ئەفەرمێ : شەو لە ڕۆژ**

**[تفسير الطبري : ٣ / ٢٤٨]**

**ورد ورد سەرنجی ئەم ووتەیەی قتادة بدە :**

٧ - **قتادة بن دعامة السدوسي** ( ١١٨ هـ ) مردووە :

﴿ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى اللَّيْلِ ﴾ **[البقرة:187]** ، دەڵێ : ئەوانە دوو نیشانە و دوو سنوری ڕوونن ، با بانگی بانگبێژەکان یان کەم عەقڵێک ڕێگریتان لێ نەکات لە پارشێوتان ، چونکە ئەوان بەشێکی شەو ڕۆییوە بانگ ئەدەن بە شەوێکی درێژ ، وە هەندێک جار سپیاییەک دەبینرێ لە کاتی پارشێودا : پێی ئەوترێ بەیانی درۆزن ، عەرب ناویان لێ نابوو ، با ئەوە ڕێگریتان لێ نەکات لە پارشێوەکانتان ، چونکە بەیان هیچ شاراوەییەکی تێدا نیە ، ڕێگایەکی دەرخەرە لە ئاسۆدا ، جا بخۆن و بخۆنەوە تاوەکو بەیان هەرکاتێک ئەوەتان بینی خۆتان بگرنەوە.

**[تفسير الطبري : ٣ / ٢٤٩]**

٨ - تابعي **إسماعيل السدي** « **الكبير** » (١٢٧ هـ ) دەڵێ :

﴿ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ﴾ **[البقرة: 187]**، تاوەکو ڕۆژتان لێ ڕوون ئەبێتەوە ، ﴿ ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى اللَّيْلِ ﴾.

**[تفسير الطبري : ٣ / ٢٤٩]**

٩ - **مقاتل بن سليمان** ( ١٥٠ هـ ) دەڵێ :

﴿ وَكُلُوا وَاشْرَبُو حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى اللَّيْلِ ﴾ **[البقرة:187]**، تاوەکو ڕووی ڕۆژتان بۆ دەرئەکەوێت ، واتە : سپیایی ڕۆژ لە ڕەشایی شەو لە بەیاندا ، ﴿ ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى اللَّيْلِ ﴾

وە خيط الأبيض واتە : یەکەم سپیایی بەیان ئەو ڕووناکیەی ئاسۆییە لە خۆرهەڵاتەوە ، وە خيط الأسود یەکەم تاریکی شەوە.

**[تفسير مقاتل بن سليمان : ١ / ١٦٤]**

١٠ - **عبد الرحمن بن زيد بن أسلم** ( ١٨٢ هـ ) ئەفەرمێ :

« حتى يتبين لكم الخيط الأبيض من خيط الأسود من الفجر »

خيط الأبيض : ئەوەیە ئەکەوێتە ژێر شەوەوە شەو دەرئەخات وە ڕەشەکە لەسەرەوەیەتی « من الفجر » ئەفەرمێ : ئەو الخيط ە سپیەیە کە لە بەیانە وەک پاڵدان بۆ لای هەموو بەیان نییە جا کاتێک الخيط ە سپیە هات کە سەرەتاکەیەتی نوێژ حەڵاڵ ئەبێت وە خواردن و خواردنەوە حەڕام ئەبن لەسەر کەسی بە ڕۆژوو.

**[تفسير الطبري : ٣ / ٢٦١]**

# بۆ ئەوانەی لەسەر گومان واز لە خواردن و خواردنەوە ئەهێنن

١ - **عـون بن عـبد الله** ( ٦١ هـ ) دەڵێ :

دوو پیاو چوونە لای **أبوبکر** لەو کاتەی ئەو پارشێوی دەکرد یەکێکیان ووتی : بەیان هەڵهاتووە ، ئەوی دیکە ووتی : هێشتا هەڵنەهاتووە.

**أبو بکر « رضي الله عنه » فەرمووی : بخۆ جیاوازی کەوتە نێوانیان.**

**[مصنف ابن أبي شيبة : ٩١٤٤]**

٢ - عُمارة بن زاذان **لە مکحول** ەوە دەڵێ :

بینیم **ابن عمر** « عبد الله بن عمر بن الخطاب » رضي الله عنهما دۆڵچەیەک « دۆلکەی ئاو دەرهێنان » ئاوی زەم زەمی گرتە دەستی ، بە دوو پیاوی ووت : سپێدە هەڵهاتووە ؟

یەکێکیان ووتی : نەخێر ، ئەوی دی ووتی : بەڵێ

ئەویش خواردیەوە.

**[مصنف ابن أبي شيبة : ٩١٤٦]**

٣- پرسیارکرا لە **ابـن عـبـاس** ( ٦٨ هـ ) رضي الله عنه :

کەی دەست هەڵبگرم لە پارشێو ؟ ، پیاوێک ووتی : ئەگەر گومانت بوو ،

ابن عباس فەرمووی : هەموو شتێک ئەگەر گومانت بوو تاوەکو ئەو کاتەی بۆت ڕوون ئەبێتەوە.

**[مصنف ابن أبي شيبة : ٣ / ٢٥ – ٢٦]**

٤ - **مسلم بن صبيع** دەڵێ :

پیاوێک ووتی بە **ابن عباس** : ئەگەر گومانم هەبوو لە « فەجر » وە دەمویست بە ڕۆژوو ببم ؟

فەرمووی : **بخۆ کاتێک بە گومانیت تاوەکو گومانت نامێنێت.**

**[مصنف ابن أبي شيبة : ٩١٤٣]**

٥ - **مجاهد بن جبر** ( ١٠٤ هـ ) ئەفەرمێ :

﴿ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ ﴾ کاتێک پیاوێک پارشێوی کرد وە بینی شەوی بەسەرەوەیە ، وە بە دڵنیایی بەیان هەڵهاتووە با ڕۆژووەکەی تەواو بکات ، چونکە الله ئەفەرمێ : وکلوا واشربوا حتى يتبين لكم. وە ئەگەر خواردی و وایزانی خۆر ئاوا بووە وە ئاوا نەبوو بوو ئەوە ئەبێت ڕۆژووەکەی بگرێتەوە.

**[تفسير سعيد بن منصور]**

٦- لە **ابن عباس**ەوە (رضي الله عنه) ووتی :

بە دوو خزمەتکاری منداڵی خۆی لە ماڵی أم هانئ بوو مانگی رمضان بوو وە پارشێوی ئەکرد دوو خزمەتکاری خۆی ، یەکێکیان ووتی : بەیان هەڵهات ، ئەوی دیکە ووتی : هەڵنەهاتووە.

فەرمووی : تێر ئاوم بکەن « ئاومبدەنێ ».

**[مصنف ابن أبي شيبة : ٩١٤٩]**

٧ - **يزيد بن يزيد** (١٣٤هـ) دەڵێ :

بیستم لە **الحسن**ەوە کاتێک پیاوێک پێی ووت : پارشێو ئەکەم و گومانم بۆ پەیدا ئەبێت لە بەرەبەیان ؟

**الحسن البصري فەرمووی : بخۆ گەر گومانت بوو ، سوێند بە الله بەیان هیچ شاراوەییەکی تێدا نیە.**

**[مصنف ابن أبي شيبة : ٩١٥١]**

٨ - الفضل بن دَلهم **لە الحسن**ەوە دەڵێ :

عمر « بن الخطاب رضي الله عنه » فەرمووی : **ئەگەر دوو پیاو بە گومان بوون لە فەجر با بخۆن تاوەکو دڵنیا ئەبنەوە.**

**[مصنف ابن أبي شيبة : ٩١٥٢]**

٩ - **مسلم بن صُبيع** دەڵێ :

پیاوێک هاتە لای **ابن عباس** « رضي الله عنهما » پێی ووت : **کەی دەست هەڵبگرم لە پارشێو ؟ پیاوێک دانیشتبوو لە لای ووتی : بخۆ تاوەکو گومانت بۆ پەیدا ئەبێت کە وابوو دەست هەڵبگرە.**

**ابن عباس فەرمووی : بخۆ تاوەکو کاتێک گومانت هەبوو تاوەکو گومانت نامێنێت.**

**[مصنف ابن أبي شيبة : ٩١٥٣]**

**ووتم :** چی لەم ووتانە بەهێز ترە بۆ ئەوانەی لەم بابەتە بە گومانن و لەسەر گومان واز لە پارشێو ئەهێنن ، وە ئەم ووتانە بەڵگەی زۆر بەهێزن بۆ ئەو ڕێسایەی سەرەتا کە باسم کرد و جێبەجێ کردنی بەسەر ئەم باسەدا ، تاوەکو دەر بکەوێ کە قسەی گیرفانی خۆمم نەهێناوە بەڵکو لەسەر مەنهەجی سەلەف ئەو ڕێسایەم داناوە .

# بەیان دوانن وە نیشانەکانی ناسینەوەی فەجر (بەیان) و شوێن و چۆنیەتی هەڵهاتن و دەرکەوتنی

١ - **سمرة بن جندب** دەڵێ :

پێغەمبەرﷺ فەرمووی : با بانگی بیلال ڕێگریتان لێ نەکات لە پارشێوەکانتان بەڵکو « فەجر » ە بەیانە بەرِبڵاوەکە لە ئاسۆدا .

واتە : کە ئەوەتان بینی خۆ بگرنەوە لە خوردن و خواردنەوە.

[صحيح مسلم : ١٠٩٤]

٢ - **وعائشة** ( ٥٨ هـ ) ( رضي الله عنها ) دەفەرمێ :

پێغەمبەرﷺ فەرمووی : با بانگی بیلال ڕێگریتان لێ نەکات لە پارشێوەکانتان ، چونکە ئەو بە شەو بانگ دەدات ، بخۆن و بخۆنەوە تاوەکو گوێتان لە بانگی

« عبد الله » بن مكتوم ئەبێت ، چونکە ئەو بانگ نادات تاوەکو فەجر هەڵدێت .

[صحيح البخاري : ١٩١٨ ، ١٩١٩]

**بڕوانە :** چۆن ئەوکاتەی بیلال بانگی تێدا ئەدات بە شەو ئەژمار ئەکات چونکە أصل وایە کاتەکە شەوە و یەقینی لەسەر ئەوە دامەزراوە ، جا بە گومان و دوو دڵی و ڕاڕایی یەقین ناڕوات بەڵکو ئەبێت دڵنیا بیت لەوەی فەجر هەڵهاتووە ئەوکاتە پارشێو واز لێبهێنیت .

لە فەرموودەیەکی دیکە ڕوون ئەبێتەوە بۆچی بانگی عبد الله بن مكتوم ئەژمار ئەکرێ بۆ هەڵهاتنی بەیان چونکە ئەو بانگ نادات تاوەکو پێی دەوترێ چوویتە ناو فەجرەوە وەک لەمەو دوا دێت .

٣ - **طلق بن علي** دەڵێ :

پێغەمبەرﷺ فەرمووی : بخۆن و بخۆنەوە وە ڕووناککەرەوە بەرزکەرەوەکە « ستونیەکە » وەڕزتان نەکات « وەرتان نەچەرخێنێت لە پارشێو » ، بەڵکو بخۆن و بخۆنەوە تاوەکو سوراییەکەتان بۆ دەرئەکەوێت .

[سنن الترمذي : ٧٠٥]

**أبو عيسى الترمذي** ( ٢٧٩ هـ)دەڵێ :

وە کارپێکراو ڕاست لە لای زانایان ئەوەیە کە خواردن و خواردنەوە حەڕام نابێت لەسەر ڕۆژووەوان تاوەکو بەیانی سووری پانتایی ، وە هەموو زانایان دەیڵێن .

٤ - **محمد بن عبد الرحمن بن ثوبان** بە مورسەلی دەڵێ :

پێم گەشتووە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی : بەیان « فەجر » دووانە ، جا ئەوەیان کە وەک کلکی گورگ وایە ئەوە هیچ شتێک حەڵاڵ ناکات و حەڕامی ناکات ، بەڵکو ئەوەی درێژە ئاسۆ ئەگرێت ئەوە نوێژ حەڵاڵ ئەکات و خواردن حەڕام ئەکات .

[تفسير الطبري تفسير الطبري : ٣ / ٢٥٢]

٥ – **ثوبان** ( ٥٤ هـ ) دەڵێ :

جارێکیان بانگمدا پاشان چوومە لای پێغەمبەرﷺ ووتم : بانگمدا ئەی پێغەمبەری الله ، فەرمووی : بانگ مەدە تاوەکو ڕۆژ بەیان دەبێتەوە ، پاشان هاتم بۆ لای دووبارە ووتم : بانگم دا ئەی پێغەمبەری الله ، جا فەرمووی : بانگ مەدە تاوەکو بەو شێوەیە ئەیبینی ، وە دەستەکانی

کۆکردەوە پاشان جودای کردنەوە لە یەکتر .

[مصنف عبد الرزاق : ١٩٠٣]

**ووتم :** ئاماژەیە بۆ دەرکەوتنی ڕۆژ و جودا بوونەوەی لە شەو الله أعلم.

٦ - **پێغەمبەر**ﷺ ئەفەرمێ :

بەڕاستی بیلال بە شەو بانگ ئەدات ، جا بخۆن و بخۆنەوە تاوەکو ابن أم مکتوم بانگ دەدات ، پاشان فەرمووی : وە ئەو پیاوێکی کوێرە بانگ نادات تاوەکو پێی دەوترێ : بەیانت بەسەردا هات بەیانت بەسەردا هات. « یان : ڕۆشتیتە ناو بەیان»

[صحيح البخاري : ٦١٧]

٧ - **ابن شهاب الزهري** ( ١٢٤ هـ ) دەڵێ :

عروة بن الزبير هەواڵی پێدام کە **عائشة** هەواڵی پێ داوە وتوویەتی : ئافرەتە ئیمانداراەکان ئامادەی نوێژی بەیان ئەبوون لەگەڵ پێغەمبەرﷺ ، خۆیان داپێچابوو ، پاشان ئەڕۆشتنەوە بۆ ماڵەوە کاتێک نوێژیان تەواو دەکرد ، کەس نەیدەناسینەوە لە تاو « تاریکی ماوەی ئاسمان تێکەڵ بە ڕوونکای بەیان » ، یان لە ریوایەتێک یەکتریان نەدەناسیەوە .

[صحيح البخارى : ٥٧٨]

ڕوونکردنەوەی ئەم فەرموودەیەی دایە عائشة رضي الله عنها ئێستە دێت لە ووتەکی ابن رجب دا ، وە لە وەڵامی گومانەکانیش ئاماژەم پێی داوە

٨ - **يحيى بن سلام** ( ٢٠٠ هـ ) دەفەرمێ :

بەیان دوانن ، ئەوەیان کە وەک کلکی گورگ وایە ئەوە هیچ حەڵاڵ ناکات و حەڕامی ناکات ، بەڵکو ئەوەی کە بە درێژی ئاسۆی گرتووە ئەوە نوێژ حەڵاڵ دەکات و ڕۆژوو واجب دەکات .

[تفسير ابن أبي زمنين : ١ / ٢٠٢]

٩ - **ابن رجب الحنبلي** ( ٧٩٥ هـ ) دەڵێ :

وە دەربڕینی فەرموودەکەی ئەو « واتە : هى البخاري » لە **أنس** ەوە دەڵێ : پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا کە کاتی پارشێو بوو فەرمووی : ئەی أنس من ئەمەوێ بە ڕۆژوو ببم شتێک خواردنم بدەرێ ، منیش خورما م بۆ هێنا لەگەڵ دەفرێکدا کە ئاوی تێدا بوو ئەوەش لە پاش ئەوە بوو کە بیلال بانگی دابوو ،

فەرمووی : ئەی أنس بڕوانە کەسێک بێت لەگەڵم بخوات منیش بانگی زيد بن ثابت م کرد جا هات بۆ لای ووتی : من سويق م « هاڕاوە گەنم و جۆ بە تێکەڵ کردنی لەگەڵ ئاو » خواردووتەوە وە دەمەوێ بە ڕۆژوو ببم ، پێغەمبەرﷺ یش فەرمووی : وە منیش دەمەوێ بۆ ڕۆژوو ببم ، جا پارشێوی لەگەڵ کرد پاشان هەستا دوو ڕەکعات نوێژی کرد پاشان دەرچوو بۆ نوێژ.

**وە مەبەستی البخاري لە هێنانی ئەم فەرموودەیە لەم باب ەدا بەڵگە پێ هێنانەوەیەتی بۆ ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ لە کاتی الغلس دا نوێژی سپێدەی کردووە چونکە ئەو سەرەتا پارشێوی کردووە پاشان هەستاوە بۆ نوێژ وە لە نێوانیاندا تەنها ئەندازەی خوێندنی پەنجا ئایەت هەبووە.**

وە زۆربەی ریوایەتەکان بەڵگەن بۆ ئەوەی کەئەوە ئەندازەی نێوان پارشێو و نوێژە. وە لەریواتی البخاري کە لە « كتاب الصيام » دەریهێناوە ئەوە ئەندازەی نێوان بانگ و پارشێوە ، وە ئەوە ڕوون و ئاشکرایە لەسەر ئەوەی پارشێو لەدوای بانگی بیلال ەوە بووە بە ئەندازەی خوێندنی پەنجا ئایەت.

وەلە ریوایەتی **معمر** دا :

هیچ نەبووە لە نێوان پارشێویدا ، « پێغەمبەر ﷺ » وە نوێژی بەیاندا تەنها دوو ڕەکعات نوێژی بەیان نەبێت وە دەرچوون بۆ مزگەوت.

وە ئەوە بەڵگەی پێ دەهێنرێتەوە بۆ ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی سپێدەی کردووە لەو ڕۆژەدا کاتێک کە دەستی کردووە بە هەڵهاتن.

« پاشان ریواتی حذيفة دەهێنێت لە زر وە کە پێشتر هێناومانانە لەبەر درێژ نەبوونەوە داینانێمەوە »

پاشان دەڵێ :

**الجوزجاني** ( ٢٥٩ هـ ) دەڵێ :

ئەم فەرموودەیە زانایان ماندوو بوون لە تێگەشتنی .

وە کۆمەڵێک لە کووفیەکان لەوانە : « إبراهيم » النخعي بەوە لێکیانداوەتەوە دروستە پارشێو کردن دوای هەڵهاتنی سپێدە لە ئاسمان تاوەکو ڕووناکی لەسەر زەویدا بڵاو دەبێتەوە.

وە ریواتەت کراوە لە **ابن عباس** ەوە : تاوەکو ڕووناکی لەسەر چیاکان بڵاو دەبێتەوە ، وە

ئەوەی گێڕاویەتیەوە کە خواردنیان بە حەڵاڵیان زانیوە تاوەکو خۆر هەڵدێت ، بێ گومان ئەوە هەڵەی کردووە.

وە کۆمەڵێک بانگەشەی ئەوەیان کردووە کە فەرموودەی حذیفة لە سەرەتای ئیسلام دا بوو پاشان نسخ بوەوە.

وە لە المتأخرین هەیە فەرموودەی حذیفة ی بەوە لێک داوەتەوە کە دروستە خواردن لە ڕۆژی بەڕۆژوو بووندا تاوەکو دڵنیا دەبیتەوە لە هەڵهاتنی بەیان وە بایی پێویستی نیە زۆری گومان بە هەڵهاتنی.

وە أحمد و جگە لەویش دەقی ووتەی هەیە لەسەر ئەمە ، چونکە حەڕام بوونی خواردن پەیوەستە بە ڕوون بوونەوەی بەیانەوە ، وە علي لە دوای نوێژەی فەرمووی : ئێستا ڕووناکی سپی لە تاریکی شەو ڕوون بوەوە « جودا بوەوە ».

وە ئەوە دروستە چوونە ناو نوێژ پێش دڵنیا بوونەوە بە زاڵ بوونی گومان لەسەر هەڵهاتنی بەیان وەک ئەوە ووتەی زۆرینەی زانایانە وەک پێشتر باسمان کرد.

وە لەسەر ئەوە پارشێو کردن دروستە لەو کاتەدا کە دروستە نوێژی بەیان بکرێت کاتێک گومان زاڵ بوو بەوەی کە بەیان هەڵهاتووە وە دڵنیا نەبووبێتەوە.

وە کاتێک فەرموودەی حذیفة مان لەسەر ئەوە لێک دایەوە وە ئەوان خواردوویانە لەگەڵ ئەوەش دڵنیا نەبوون کە بەیان هەڵهاتووە ئەوا چوونە ناو نوێژیان لە کاتی دڵنیایی نەبووە الله أعلم.

وە حنبل « بن إسحاق » لە أحمد ەوە نقڵ دەکات ئیمام أحمد بن حنبل ئەفەرمێ : کاتێک بەیان ڕووناکی دایەوە و هەڵهاتنی ڕوون بوویەوە ، نوێژ حەڵاڵ ئەبێت و خواردن و خواردنەوە حەڕام ئەبێت لەسەر ڕۆژووەوان .

وە ئەوەش بەڵگەیە لەسەر پێکەوە بوون « تلازم » ی نێوانیان وە ئەشێ بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە دروست نیە چوونە ناو نوێژەوە تەنها دوای دڵنیا بوونەوە نەبێت لە هاتنە ناوەوەی کاتی نوێژ.

وە ڕیوایەت کراوە لە ابن عباس جگە لەویشەوە لە سەلەف پێکەوە بوون « تلازم » ی نێوان کاتی نوێژی بەیان و حەڕام بوونی خواردن لەسە ڕۆژووەوان .

وە ڕیوایەت کراوە لە ابن عباس ەوە بە مەرفوعی کە : جبریل نوێژی کرد بە پێغەمبەر ﷺ لەو ڕۆژەدا کە کاتێک خواردن حەڕام کرا لەسەر ڕۆژووەوان .
[فتح الباري لابن رجب : ٣ / ٢٢٠ – ٢٢٢]

**ووتم** : ئەکرێ ووتەی ئەو زانایانەی کە دەڵێن دروستە بە دڵنیا نەبوونەوەش لە هەڵهاتنی بەیان مرۆڤ نوێژ دابەستێت ، بەوە لێک بدرێتەوە بۆ کاتێکە ناتوانن بزانن ئایا بەیان هەڵهاتووە یاخود نا وە دەترسن کە هەڵهاتبێت و ئەجری یەکەم کاتی نوێژەکەیان لە دەست بچێ ، گەر نا بەڵگەکان و ووتەکانی سەلەف ڕوونن کە هەندێکیم هێناوە و هەندێکی دیکە لە دوایدا دێن کە ڕێگری دەکەن لە نوێژ کردن و دەست هەڵگرتن لە پارشێو پێش دڵنیا بوونەوە لە کاتی خۆی وە هەر لێرە ئیمام أحمد وای نەوتووە و ابن رجب خۆی فەرموودەی ابن عباس ئاماژە پێ دەدات کە پێچەوانەی ووتەی ئەو زانایانەیە کە ابن رجب باسیان دەکات کە وایان وتووە .

**ابن قدامة المقدسي** ( ٦٢٠ هـ ) لەسەر ئەو زاڵ بوونی گومانە لە هاتنەناوەوەی کاتی نوێژ دەڵێ : کاتێک کەسێک گومانی بوو لە هاتنەناوەوەی کاتی نوێژ ، نوێژ ناکات تاوەکو دڵنیا دەبێتەوە لە هاتنەناوەوەی یان گومانی زاڵی دەبێت ، وەکو کەسێک کە خاوەن پیشەیە ئاساییانە کارێکی بە ئەندازەی هاتنەناوەوەی کاتی نوێژەکە کردووە ، یان قورئان خوێنێک بە ئاسایی بەشێکی خوێندووە لە قورئان ئەیخوێنێت « و کاتەکە دێتە ناوەوە » وە هاوشێوەی ئەوە ، کەی ئەوەی کرد و گومانی زاڵی بوو لەسەر هاتنەناوەوەی کاتی نوێژ نوێژەکەی بۆ حەڵاڵ دەبێت وە سوننەتە دوابخرێت کەمێک احتیاطاً بۆ ئەوە گومانە زاڵەکەی زیاد بکات مەگەر بترسێ لە تەواو بوونی کاتی نوێژەکە....

**[المغني : ٢ / ٣٠- ٣١]**

ئێمەش ئەمەمان قەبوڵە و پێچەوانەی ئەمەمان نەوتووە ، بەڵام نەوەک هەرکەسێک بێت کات بۆ خۆی دیاری بکات یان خۆی پەیوەست بکات بە کاتێکی دانراوەوە کە سەد لە سەد جیاوازە لە کاتی ڕاستی هەڵهاتنی بەیان و کاتی نوێژ یان چۆن دڵی ویستی کات دابنێت جا پەلە بکات نوێژ زوو بکات بەناوی سوننەتەوە یان خۆی دوابخات و پارشێو زوو بکات بەناوی احتیاطةوە .

١٠ - **ابن قدامة** دەڵێ :

کاتی نوێژ دێتە ناو بە هەڵهاتنی بەیانی دووەم بە کۆدەنگی « بە اجماع » ، وە هەواڵەکانی کاتەکان بوونەتە بەڵگە بۆی ، وە ئەویش سپیایی دەرکەوتوو و بەربڵاوە لە ئاسۆدا وە ناوی لێ ئەنرێ بەیانی ڕاستگۆ ، چونکە ڕاست دەکات دەربارەی بەیان و ڕوونی کردۆتەوە بۆت ، وە بەیان ئەوەیە سپیایی و سورایی کۆ کردۆتەوە...

بەڵام بەیانی یەکەم ئەو سپیاییە تیژەیە کە سەرکەوتووە بە بێ پانی هیچ حوکمێک پەیوەست نیە پێیەوە ، وە ناوی لێ نراوە بەیانی درۆزن .

**[المغني : ١ / ٢٧٩]**

١١ - **مكي بن أبي طالب** ( ٤٣٧ هـ) دەڵێ :

بەیان « فەجر» ی یەکەم بەرەو ئاسمان بە درێژی ئەڕوات وەک کلکی گورگ بە تیژی سەرکەوتووە لە پانی دا نیە .

وە دووەم ئەڕوات بە لای سووریدا ، وە ڕوناکیەکەی بڵاو ئەبێتەوە لەسەر چیاکان وە بە باری پانیدایە .

**[تفسير الهداية إلى بلوغ النهاية ١: / ٦٢٥]**

## وەڵامی پێشخستنی پارشێو بە ناوی احتیاط ەوە و سەلامەتی ڕۆژووە وە ، وە سوننەتی دواخستنی

سەرەتا ئەڵێم : ئەو احتیاطە بیدعەیە و هیچ بنەمایەکی نیە لە شەرعدا چونکە نەک تەنها بەڵگەی لەسەر نەهاتووە و هاوەڵان و سەلەف نەیانکردووە بەڵکو بەڵگە و کردەوەی ئەوان پێچەوانەیەتی و لە دژی هاتووە و سوننەت دیاری کراوە کە دواخستنیەتی .

١ - **ابراهیم النخعي**( ٩٦ هـ )ئەفەرمێ :

ئەوان کاتێک کەسێک بە شەو بانگی بدابا ئەیانهێنا ئەیانفەرموو پێی : لە الله بترسە بانگەکەت بگێڕەوە .

[مصنف عبد الرزاق : ١٩٠٥]

هەروەها **ابراهیم النخعي** ئەفەرمێ : ئەوان پێیان ناخۆش بوو بانگ بدرێ پێش هەڵهاتنی بەیان.

[مصنف عبد الرزاق : ٩٠٦ ]

٢ – **أنس** ( ٩٣هـ ) دەڵێ :

**زيد بن ثابت** ووتی : ئێمە لەگەڵ پێغەمبەرﷺ پارشێومان کرد پاشان هەستاین بۆ نوێژ ، ووتمان چەندێک لە نێوانیان بوو ؟ « واتە لە نێوان پارشێوکردنتان و هەستان بۆ نوێژەکەتان »

فەرمووی : هێندەی خوێندنی پەنجا ئایەت .

[مصنف ابن أبي شيبة :٩٠١٣]

**ووتم** : بڕوانە چەندێک کاتیان تەرخان کردووە بۆ پارشێو کە بە کاتی ئێستە بە نزیکەیی لانی زۆری ناگاتە نیو کاتژمێر بۆ پارشێو کردن و دواتر کاتی نوێژ بێت .

### ٣ - سالم بن عبيد الأشجعي دەڵێ :

**من لەگەڵ أبو بكر « الصديق » بووم « رضي الله عنه » فەرمووی : هەستە دامپۆشە « بمشارەوە » لە بەیان « لە فەجر » پاشان خواردی .**

**[مصنف ابن أبي شيبة : ٩٠١٤]**

نازانم لەم ڕیوایەتە ڕوونتر ئەبێ چی بێت ؟؟ نایەوێ فەجری لێ دیار بێت تاوەکو پارشێو بکات کەسێک ئەخاتە نێوان خۆی و فەجر امام أبو بكر( رضي الله تعالى عنه ) ، من ئەوەندەشم نەوتووە من ئەڵێم با کاتی بێت ئەوکات دەست هەڵبگرن لە خواردن و خواردنەوە و نوێژ بکەن ، بڕوانە بۆ ئەمەی دواتر :

### ٤ - سالم بن عبيد دەڵێ:

من لە حوجرەی **أبو بكر الصديق** بووم ، جا شەوێکیان نوێژی کرد تا الله ویستی لەسەر بوو ، پاشان فەرمووی : بڕۆ بزانە بەرەبەیان هەڵهاتووە ؟ منیش ڕۆشتم ووتم : لە ئاسمان سپاییەک بەرز بۆتەوە ، پاشان نوێژی کرد تاوەکو الله ویستی لێ بوو ، پاشان فەرمووی : بڕۆ بڕوانە بزانە بەرەبەیان هەڵهاتووە ؟

منیش ڕۆشتم پاشان گەڕامەوە ، ووتم : پانتایی سور لە ئاسمان دەرکەوتووە ، فەرمووی : ئێستە وەرە « پەلە بکە » پارشێوەکەمم پێ بگەیەنە .

**[سنن الدارقطني - باب وقت السحور : ٢١٦٠]**

٥ - **عمرو بن حُريث** ( ٨٥ هـ ) دەڵێ:

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ : کەس هێندەی ئەوان پەلەی نەدەکرد لە بەربانگ کردنەوەدا و کەس هێندەی ئەوان لەسەر خۆو و هێواش نەبوو لە پارشێو کردندا .

[مصنف ابن أبي شيبة : ٩٠١٧]

٦ – **الشعبي** (١٠٠ هـ )ئەفەرمێ :

حذیفة هەندێک پەلەی دەرکرد لە پارشێودا تاوەکو بە نوێژ ڕابگات لەگەڵ پێغەمبەرﷺ ، جا ئەوە گەشت بە پێغەمبەرﷺ جا ئەینارد بە دوایدا ئەیخوارد لەگەڵیدا تاوەکو دەرئەچوون بۆ نوێژ .

[مصنف ابن أبي شيبة : ٩٠٢٤ ]

٧ – **الأعمش** ( ١٤٨ هـ ) **لە مسلم**ەوە ئەفەرمێ :

**ئەوان فەجر « بەیان » یان وەک ئەو فەجرەی ئێوە ئەژمار نەدەکرد ، ئەوان ئەو فەجرەیان ئەژمار دەکرد کە ماڵەکان و ڕێگاکانی پڕ دەکرد . « واتە : هاوەڵان»**

[ تفسير الطبري : ٣ / ٢٥٢]

٨ - **ابن سيرين** ( ١١٠ هـ ) ئەفەرمێ :

**دەفرێکم ئەگرت بە دەستمەوە وە سەیرم ئەکرد بزانم فەجر هەڵهاتووە .**

[مصنف ابن أبي شيبة : ٩١٥٤]

٩ - **ابراهيم النخعي** ( ٩٦ هـ ) ئەفەرمێ : لە سوننەت دواخستنی پارشێوە .

[مصنف ابن أبي شيبة : ٩٠١٩]

١٠ - **وليد بن جُميع** دەڵێ :

أبو طفيل هەواڵی پێ داین کە پارشێوی کردووە لە ناو ماڵ و منداڵەکەیدا لە جُبَّانة پاشان هات بۆ لای الحذيفة ئەویش لە ماڵی حارث بن أبي ربيعة بوو ، **بینی شیری وشترێکی بۆ دۆشی پاشان پێی دا ، ووتی : من ئەمەوێ بە ڕۆژوو ببم ، ئەویش فەرمووی : منیش ئەمەوێ بە ڕۆژوو ببم ، جا حذيفة خواردیەوە ، پاشان دەستی گرت و بەڕێ کەوت بۆ مزگەوت کاتێک کە نوێژ کرا .** « واتە کاتی نوێژ »

[مصنف ابن أبي شيبة : ٩٠٢٠ ]

١١ - **ابن سيرين** ئەفەرمێ :

نێوان پارشێوی پیاوێک و بانگی بانگ بێژ ئەندازەی خوێندنی سورەتی یوسف ە .

[مصنف ابن أبي شيبة : ٩٠٢١]

**ووتم** : جا بزانە منشاوي بە ترتيل ٤٠ خولەک سورەتی یوسف تەواو دەکات لە کاتێکدا ئەو بۆ فێر بوونی تەجوید ئەیخوێنێت کە نابێت هەڵەی تێدا بکات ، جا وەرە کەسێک بۆ خۆی بخوێنێت کە هیچی زۆر بڕوا ٢٠ خولەک نابات ئەیخوێنێت بە جوانیش مادام بۆ خۆی بێت .

١٢ - **مجاهد** ئەفەرمێ :

لە ڕەوشتی پێغەمبەران « عليهم الصلاة والسلام » دواخستنی پارشێوە .

**[مصنف ابن أبي شيبة : ٩٠٢٤]**

**سەرنجی ئەم ئەثەرانە بدە تاوەکو بۆت دەرکەوێ چۆن پارشێو دەکرێ و تا چەند احتياط دەکرێ بۆ کاتی پارشێو :**

١٣ - اسماعيل بن عُلَيَّة لە **ابن عون**ەوە دەڵێ :

محمد پارشێوی کرد لە کاتێکدا ئەیبینی شەوی بەسەرەوەیە ، پاشان لەلای ڕوون بوویەوە کە پارشێوی پاش بەیان کردووە ، جا ووتی : من بە ڕۆژوو نیم « شکاندوومە » .

**[مصنف ابن أبي شيبة : ١٩٢٣]**

١٤- **مجاهد** رحمه الله ، دەربارەی کەسێک پارشێوی کردووە لە کاتێکدا بینیویەتی شەوی بەسەرەوەیە ، پاشان دەرکەوت کاتێک پارشێوی کردووە کە بەیان هەڵهاتووە ، دەفەرمێ : **با ڕۆژووەکە تەواو بکات** ، « نەیشکێنێت ».

**[مصنف ابن أبي شيبة : ١٩٢٤]**

١٥ - **شعبة** ( ١٦٠ هـ ) دەڵێ :

پرسیم لە **الحكم** دەربارەی کەسێک پارشێو ئەکات لە کاتێکدا ئەبینێ شەوی بەسەرەوەیە ؟

فەرمووی : **ڕۆژوەکەی تەواو دەکات .**

**[مصنف ابن أبي شيبة : ١٩٢٥]**

١٦ - **سعيد بن جبير** (٩٥ هـ ) دەفەرمێ :

ئەگەر خواردی پاش هەڵهاتنی بەیان وە ڕۆیی بوو بەسەر ڕۆژوەکەیدا لەو کاتەدا ڕۆژێک دەگرێتەوە لە جێگەیدا .

**[مصنف ابن أبي شيبة : ١٩٢٦]**

١٧ - **الحسن البصري** (١١٠ هـ ) ( رحمه الله) **دەربارەی پیاوێک کە شەوی بە سەرەوەیە و پارشێو ئەکات دەڵێ : ڕۆژووەکەی تەواو دەکات .**

**[مصنف ابن أبي شيبة : ١٩٢٧]**

١٨ - **جابر بن زيد** ( ٩٣ هـ ) **« بە هەمان شێوە » دەڵێ : ڕۆژووەکەی تەواو دەکات .**

**[مصنف ابن أبي شيبة : ١٩٢٨]**

١٩ - **ابن سيرين** رحمه الله دەڵێ :

هەرکەس سەرەتای ڕۆژ خواردی ، با کۆتایەکەی بخوات .

**[مصنف ابن أبي شيبة : ١٩٢٩]**

٢٠ - فضيل بن عياض لە **منصور بن المعتمر** ( ٢٣ هـ ) ەوە دەڵێ :

ووتم « **بە أبو بكرالصديق** » : پانتایی لە ئاسمان گرتووە و سوور بووە ، فەرمووی : ئێستە خواردنەوەکەم بۆ بهێنە ، ڕۆژێکی دیکە فەرمووی : هەستە لەسەر دەرگاکە بوەستە لە نێوان من و سپێدەدا .

**الدارقطني لەسەر ئەم ئەثەرە دەڵێ : وهذا اسناد صحيح .**

**[سنن الدارقطني باب - وقت السحور ١ ٢١٦]**

٢١ ـ **وكيع بن الجراح** دەڵێ :

**الأعمش دەیووت : ئەگەر ناوبانگ نەبوایە ئەوە پارشێو لە پاش نوێژ دەکرد .**

**« واتە : نوێژم دەکرد پاشان پارشێوم دەکرد ».**

**[مسائل الامام أحمد رواية صالح : ١١٣٨]**

دەزانی ئەم ووتانە لە **التابعين** « شوێنکەووتوانی هاوەڵان » واتای چییە ؟

واتای ئەوەیە ئەوان بە سەرەتای دەرچوونی بەیان ڕۆژووی ڕۆژوەوان بە بەتاڵ ئەژمار ناکەن مادام نەیزانیوە کە بەیان هەڵهاتووە و لەکاتی پارشێو کردندا سپێدە دەرکەوتووە .

ڕاستە گەر زانرا سپێدە دەرکەوتووە نابێ پارشێو بکرێ و کاتی خواردن و خواردنەوە نامێنێ ، بەڵام گەر کەسەکە بینی شەوە پارشێوی کرد و لە کاتی پارشێو کردنیدا سپێدە دەرکەوت لەو کاتەدا ئەفەرموون با ڕۆژووەکەی تەواو بکات .الله أعلم

**بۆ دڵنیایی زیاتر و تێگەشتنی زیاتر لە ووتەکە بڕوانە ئەم ووتەیە :**

**ابن حجر العسقلاني** الأشعري ( ٨٥٢ هـ ) دەڵێ :

کۆمەڵێک لە هاوەڵان و الأعمش و هاوەڵەکەی أبو بکر العیاش لە التابعین بۆ ئەوە ڕۆشتوون کە دروستە پارشێو کردن تاوەکو سپێدە ڕوون ئەبێتەوە ... لە دوای ئەوە کە ووتەکانیان باس دەکات ، پاشان دەڵێ : اسحاق دەڵێ : ئەوانە خواردن و نوێژ کردن بە دروست ئەزانن لە دوای هەڵهاتنی سپێدە ئاسۆییەکە تاوەکو سپیایی ڕۆژ لە ڕەشایی شەو جودا دەبێتەوە .پاشان اسحاق دەڵێ : من ووتەی یەکەم دەڵێم بەڵام تانە لە کەسێک ناکەم کە تەئویلی روخسەت دەکات وەکو ووتەی دووەم ، وە من گێڕانەوەشی لەسەر نابینم » واتە : گرتنەوەی ڕۆژووەکە « وە کەفارەتیشی لەسەر نابینم .

[شرح صحيح البخاري لابن حجر : ٤ / ١٣٦ - ١٣٧]

# کۆتایی ئایەتەکە فەرمایشتی الله سبحانه و تعالی

﴿ ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى اللَّيْلِ ۚ ﴾

واتە : پاشان ڕۆژووەکە تەواو بکەن تاوەکو شەو ، واتە کاتی خۆرئاوابوون .

## تەفسیری ئایەتەکە لەلای پێغەمبەرﷺ و سەلەف و پەلە کردن لە بەربانگ کردنەوە و دوانەخستنی :

١ - **لە عمر بن الخطاب** ( ٢٣ هـ ) ەوە ( رضي الله عنه )

پێغەمبەرﷺ فەرمووی : کاتێک شەو پێش هات لێرەوە و ڕۆژ پشتی هەڵکرد لێرەوە و خۆر ئاوا بوو ئەوە بەربانگی ڕۆژووەوانە .

[صحيح البخاري : ١٩٥٤]

٢ - **عبد الله بن أبي أوفى** ( ٨٧ هـ ) دەڵێ :

ئێمە لەگەڵ پێغەمبەرﷺ لە گەشت بووین ئەو بە ڕۆژوو بوو جا کاتێک خۆرا ئاوا بوو بە هەندێ کەسی فەرموو : ئەی فڵان هەستە هاڕاوی گەنم و ئاومان بۆ ئامادە بکە « خواردنێکە هاڕاوەی گەنم و ئاو تێکەڵ دەکرێ تاوەکو یەکسان ئەبن و تەواو تێکەڵ ئەبن » ووتی : ئەی پێغەمبەری الله با بگەیتە ئێوارە ، فەرمووی : دابەزە « بۆمان ئامادە بکە » ووتی : ئەی پێغەمبەری الله تۆ هێشتا ڕۆژت بە سەرەوەیە واتە : « هێشتا لە ڕۆژدایت » ، فەرمووی : دابەزە بۆمان ئامادە بکە .جا دابەزی و ئارد و ئاوەکەی تێکەڵ کرد ، پێغەمبەرﷺ خواردیەوە

پاشان فەرمووی : ئەگەر شەوتان بینی لە وێوە پێش هات و ئەوە کاتی ڕۆژوو شکاندنی ڕۆژووەوانە بە پەنجەی ئاماژەی بۆ خۆرهەڵات کرد .

[صحيح البخاري : ٢٣٥٢]

### ٣ - **أبو حمزة الضُبَعي** دەڵێ :

کە ئەو لەگەڵ ابن عباس رضي الله عنهما بەرِبانگی دەکردەوە لە رمضاندا ، جا کاتێک ئێوارە ئەبوو کچێکی هەڵگیراو یان زڕکچێکی هەبوو ئەینارد سەردەکەوت بەسەر درەختێکدا « واتە بۆ ئەوەی پێی ڕابگەیەنێت کە خۆر ئاوا بوو » ، جا کاتێک خۆر ئاوا دەبوو بانگی دەکرد « یان بانگی دەدا » ، ئەو ئەیخوارد و ئێمەش ئەمانخوارد ، پاش ئەوەی کە لێ ئەبوەوە ، قامەت دەکرا و نوێژی دەکرد و ئێمەش نوێژمان لەگەڵی دەکرد .

[مصنف ابن أبي شيبة : ٩٠٢٧]

### ٤ - **أبو هريرة** ( ٥٩ هـ ) رضي الله عنه دەڵێ :

پێغەمبەرﷺ فەرمووی : بەردەوام دین ئاشکرایە تاوەکو خەڵکی لە بەربانگ کردنەوەدا پەلە بکەن ، گاور و جوەکان دوای دەخەن .

[ مصنف ابن أبي شيبة : ٩٠٢٨]

### ٥ - **عبد الرحمن بن حرملة** ( ١٤٥ هـ ) :

لە **سعيد بن المسيب** ەوە رحمه الله لێی بیستووە کە وتوویەتی : پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی : بەردەوام خەڵکی لەسەر چاکەن تاوەکو لە بەربانگ کردنەوە پەلە بکەن وە دوای نەخەن وەک دواخستنی خەڵکی ڕۆژهەڵات .

[مصنف ابن أبي شيبة : ٩٠٣٠]

٦ - **سعيد بن المسيب** ( ٩٤ هـ ) رحمه الله دەڵێ :

**عمر** (رضي الله عنه) ئەینوسی بۆ کاربەدەستەکانی : لە دواخەران مەبن لە بەربانگ کردنەوەکانتاندا ، وە چاوەڕێ مەکەن بۆ نوێژەکانتان تاوەکو کاتی بەیەکدادانی «بە یەک گەشتنی ئەستێرەکان» .

[مصنف ابن أبي شيبة :٩٠٣١]

٧ - **ثروان بن ملحان التيمي** دەڵێ :

پیاوێک ووتی بە بە عمار : أبو موسی فەرمووی : بەربانگ مەکەنەوە کاتێک ئەستێرەکان دەرئەکەون ، چونکە ئەوە لە کاری جوەکانە .

[مصنف ابن أبي شيبة : ٩٠٣٢]

٨ - **علقمة** دەڵێ :

**دەفرێک « قاپێک » یان هێنا بۆ عبد الله ( بن مسعود ٣٣ هـ ) : ووتی بە خەڵکەکە : نزیک ببنەوە بخۆن ، پیاوێک لەوان دوورەپەرێزی گرت ، عبد الله پێی ووت : چیتە ئەوە ؟ ووتی : بەڕۆژووم ، عبد الله ووتی : ئەوە سوێند بەوەی هیچ کەسێک شایەنی پەرستن نیە جگە لەو ئێستە حەڵاڵە خواردن بۆ بخۆر .**

[مصنف ابن أبي شيبة :٩٠٣٣]

٩ - **عبد الرحمن بن أيمن** : لە باوکیەوە لە **أبو سعيد الخدري** ەوە رضي الله عنه دەڵێ :

چوومە لای بەربانگی دەکردەوە لەسەر ئێسقانێک کە گۆشتەکەی خوراوە لە کاتێکدا من ئەمبینی خور ئاوا نەبووە .

**[مصنف ابن أبي شيبة : ٩٠٣٤]**

١٠ - الأعمش لە **مجاهد** ( ١٠٤ هـ ) ەوە دەفەرمێ :

**من دەهاتم بۆ لای ابن عمر لەکاتی بەربانگیدا دامئەپۆشی لە شەرمی ئەوەی خەڵکی ببینن .**

**[مصنف ابن أبي شيبة : ٩٠٣٥]**

ووتم : سبحان الله لەو کاتیش مرۆڤی لەو شێوەیە هەبووە دیارە مێشکیان هێندە قورس بووە کە ابن عمر بەو پلە و گەورەییەی هەیبووە لە نێو هاوەڵاندا ببینن بەربانگ بکاتەوە قسەی لەسەر بکەن ، **دەی تۆش لەبەر کەس واز لە دینی الله مەهێنە مادام لەسەر حەق بیت .**

١١ - **عبد الرحيم بن سليمان** :

لە **الهَجَري** ەوە لە پیاوێکەوە لە بني سوارة دەڵێ : کەوتمە ڕێ بۆ لای حذيفة دابەزیم لەلای ، ئەو کاتێک خۆر ئاوا ببوایە نە دەمایەوە تەنها کەمێک نەبێت تاوەکو بەربانگی دەکردەوە .

**[مصنف ابن أبي شيبة : ٩٠٣٦]**

١٢ - **مسلم بن يزيد** لە باوکیەوە دەڵێ :

**علي بن أبي طالب** ( رضي الله عنه) دەیفەرموو بە ابن النبَّاح : خۆر ئاوا بوو ؟ دەیووت : پەلە مەکە « واتە : هێشتا نەخێر » ، دەیفەرموو : خۆر ئاوا بوو ؟ دەیووت : پەلە مەکە ، کاتێک بیوتبا بەڵێ ، بەربانگی دەکردەوە پاشان دادەبەزی و نوێژی دەکرد .

[مصنف ابن أبي شيبة : ٩٠٣٧]

١٣- **سهل بن سعد** دەڵێ :

**پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : بەردەوام ئەم ئوممەتە لە چاکن مادام پەلە بکەن لە بەربانگ کردنەوەدا .**

[مصنف ابن أبي شيبة : ٩٠٣٨]

١٤ - **عبد الرحمن بن حرملة**

**لە سعيد بن المسيب ەوە دەفەرمێ : ئەگەر بينيت عصر ت لێ ڕۆشت ئەوە بخۆرەوە .**

[مصنف ابن أبي شيبة : ٩٠٣٩]

١٥ - **عمرو بن مروان** دەڵێ :

**ابراهيم دەیفەرموو : بە ڕاستی لە سوننەت پەلەکردنە لە بەربانگدا .**

[مصنف ابن أبي شيبة : ٩٠٤٠]

١٦ - **موسى بن أنس** دەڵێ :

**أنس بن مالك** ( رضي الله عنه ) کەنیزەکەکەی سەردەخست بەسەر سەربانی خانووەکە ، دەیفەرموو : ئەگەر ئاسۆ یەکسان بوو بانگم لێ بکە « هەواڵم پێ بدە» .

**[مصنف ابن أبي شيبة :٩٠٤١]**

١٨ - **أبو الدرداء** ئەفەرمێ :

سێ شت لە خوڕەوشتی پێغەمبەرانە عليه الصلاة والسلام : پێشخستنی بەربانگ ......تا کۆتایی ووتەکە .

**[مصنف ابن أبي شيبة : ٩٠٤٢]**

١٨ - **قيس** دەڵێ :

**عمر بن الخطاب** قاپێکی دا بە پیاوێک لە تەنیشتی بوو کاتێک خۆر ئاوا بوو ، پێی فەرموو : ڕەنگە لە دواخەران بیت لە بەربانگ کردنەوەتدا ، دواتر دواتر .

**[مصنف ابن أبي شيبة :٩٠٤٣]**

# وەڵامی هەندێ گومان

**گومانی یەکەم : هەندێک دەڵێن  هاوەڵان نوێژیان درێژ بووە چەندین ئایەتیان خوێندووە و کاتێک هاتوونەتە دەرەوە یەکدیان نەدەناسیەوە ئەمە واتای ئەوەیە کە کاتەکەی زۆر زوو بووە و ئەم کاتە نەبووە کە ئێستە ئێوە دەڵێن : کاتی نوێژە چونکە لە نێوان ئەمەی ئێوە دیاریتان کردووە لەگەڵ خۆرهەڵهاتن ماوەیەکی کەمە .**

**لە وەڵامدا دەڵێم** : سەرەتا کێ ووتی هاوەڵان هەموو جارێک نوێژیان درێژ بووە ؟

ئەوەتا **الشافعي** وەک لە تەفسیرەکەیدا هاتووە دەڵێ : قورئان خوێندنی درێژیان هەبووە و کورتیشیان هەبووە . پاشان درێژی ئەو شەوە چۆن دیاری دەکەیت تۆ لە پاش نوێژی عشاء ەوە تاوەکو خۆرهەڵاتن کاتێکی درێژە چۆن دیاری دەکەی ئەوان کەی دەستیان کردووە بە نوێژ ؟؟

**ابن رجب الحنبلي** ئەم فەرموودەیەی عائشة دەهێنێت رضي الله عنها کە دەفەرمێ :

ئافرەتانی پێغەمبەر ﷺ ئامادەی نوێژی سپێدە دەبوون لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ سەریان داپۆشرا بوو بە پارچەیەک لە جل و بەرگیان پاشان دەڕۆشتنەوە بۆ ماڵەوە دوای ئەوەی نوێژیان دەکرد هیچ کەس نەیدەناسینەوە لەبەر الغلس.

دوای ئەوەی باسی ڕیوایەتی ئیمام مالک و جگە لەوانیش دەکات ، دواتر دەڵێ : فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر تەغلیسی پێغەمبەر ﷺ لە سپێدەدا ، چونکە ئەو قورئان خوێندنی تێدا درێژ دەکاتەوە لەگەڵ ئەوەشدا ئەو تەواو دەبوو لە غەلسدا.

ئەگەر ووترا : لە فەرموودەی **أبي برزة** دا هاتووە کە : ئەو تەواو دەبوو لە نوێژی سپێدە « هەڵدەستا لێی » لەو کاتەی کە پیاو جەلیسی خۆی دەناسیەوە وە ئەوەش پێچەوانەی فەرموودەی عائشةیە.

« الجليس - جەلیس : ئەو کەسەی نزیکە لێتەوە لە کاتی دانیشتندا جا لە کاتی نوێژدا بێت یاخود هەر کارێکی دیکە و هەر شتێکی دیکە » .

دەوترێ : هیچ جیاوازیان تێدا نیە چونکە ناسینەوەی کەسێک کە لە تەنیشتیدا دانیشتووە لە تاریکی غەلەسدا ، وا پێویست ناکات کە کە ئافرەتێک بناسێتەوە کە لەدوور ئەوەوە دەڕوات و سەری داپۆشراوە.

وە **الشافعي** فەرموودەی **أبي برزة** ی ڕیوایەتی کردووە لە کتێبی « اختلاف علي و عبد الله » لە ابن علية وە لە عوف ەوە لە أبي منهال ەوە لە أبي برزة ەوە : کە پیغەمبەر ﷺ نوێژی بەیانی دەکرد پاشان هەڵدەستاین وە هیچ یەکێک لە ئێمە دانیشتووی تەنیشتی نەدەناسیەوە.

**البيهقي** دەڵێ : ئەو کتێبە نەخوێندراوەتەوە بەسەر الشافعي دا ، هەڵدەگرێ کە ووتەی : هیچ یەکێک لە ئێمە دانیشتووی تەنیشتی نەدەناسیەوە وەهم بێت لە نوسەرەوە ، چونکە لە هەموو ڕیوایەتەکانی دیکەدا ئەوە هاتووە کە : تاوەکو هەر یەکێک لە ئێمە دانیشتووی تەنیشتی دەناسیەوە. انتهی.

وە ئاشکرا ئەوەیە : أبو برزة مەبەستی ئەوە بووە کە هەر پیاوێک دانیشتووی تەنیشتی دەناسیەوە گەر چەند جارێک سەیری کردبا.

وە بەڵگەی دیکە لەسەر ئەوە : کۆمەڵێک فەرموودەی دیکە هەن ، لەوانە : فەرموودەی **قيلة بن مخرمة** ، کە هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا ئەو نوێژی بەیانی دەکرد بۆ خەڵکی وە نوێژ کرا کاتێک بەیان جودا بوەوە وە ئەستێرەکان لێک ئاڵا بوون لە ئاسماندا ، وە پیاوان خەریک بوو یەکدیان نەدەناسیەوە لەتاو تاریکی شەو .

ئیمام أحمد دەریهێناوە.

وە ئەمەش هەواڵدانە لە کاتی نوێژکردن نەوەک کاتی تەواو بوون لەنوێژ و هەستان لێی.

پاشان دوو ڕیوایەتی دیکە دەهێنێ لەو بابە ، پاشان دەڵێ :

قسەکردن لێرەدا لەسەر دوو بابەتە :

یەکەمیان : ئەمما یەکەم کاتی نوێژ هەڵهاتنی بەیانی دووەمە ئەوە لەوانەیە کە هیچ جیاوازی تێدا نیە.

وە بێ گومان أبو موسى و ابن عمر نوێژی بەیانیان گێڕایەوە کاتێک بۆیان ڕوون بوویەوە کە ئەوان نوێژیان کردووە پێش ئەوەی بەیان هەڵبێت.

[فتح الباري لابن رجب الحنبلي : ٣ / ٢٢٣ – ٢٢٦]

**گومانی دووەم : بیستم کەسێک دەڵێ أصلا هەموو هاوەڵان نەیانزانیوە فەجر دیاری بکەن و چەند دانەیەکن زانیویانە ، ئەم مامۆستا ویستی بەرگری لە شتێک بکات کە هەڵەیە هات هەڵەیەکی تری هێنا تاوەکو بیسەلمێنێ ، بۆیە حاڵی لەوە خراپ تر بوو کە پێشتر تێیدا بوو. هەر بە هیچی نازانم ئەمە تاوەکو وەلامی بدەمەوە بەڵام چەن شتێک دەڵێم هەر ڕەنگە لەسەر دڵی هەندێک قورس بێت .**

## بە کورتی دەڵێم :

ئەو دەڵێ : لە ناو هاوەڵان چەن کەسێک زانیویانە کە کاتەکەی کامەیە .

أ - **دەڵێم** : سەرەتا ئەمە پێویستی بە سەلماندنە نازانم لە کوێ هێناویەتی ئەم قسەیە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەش پێغەمبەرﷺ بەو فەرموودانەی لەسەرەوە هێناومە بۆ خەڵکی ڕوون ئەکاتەوە بگرە لە لە باسێکی شاراوە باسی ناکات بەڵکو بە جۆرێک قسە لەگەڵ هاوەڵان دەکات وەک بڵێی چۆن باسێکی وا ئاسان تێگەشتوون وەک کە بەڵگە باسی فەجر دەکات کە لە ئایەتەکەدا هاتووە ، لەگەڵ ئەوە باسەکە پەیوەندی بە ژیانی ڕۆژانەی موسڵمانانەوە هەیە ،

وەک ئەوەیە بڵێی دەستنوێژ گرتن چەند هاوەڵێک زانیویانە و بابەتێکی شاراوەیە ، هیچ جیاوازیان نیە ئەومەرجی دروستی نوێژە ئەمیش بە هەمان شێوە ،

ئەو بە ڕاشکاوی ئایەت و فەرموودەی لەسەر هاتووە ئەمیش بە هەمان شێوە ، ئەو کەسی منداڵ و شێت نەبێت بۆی ئاسانە زانینی ئەمیش بە هەمان شێوە.

جگە لەوەش من چەند ریوایەتم هێنا لە سەلەفەوە کە پێچەوانەی ئەوە بوو ئەو ووتی لەبەر درێژ نەبوونەوە باسەکە هەموویان دا نانێم بەڵام بگەڕێنەوە بەناو ریوایەتەکاندا بڕوانن تەنها چەند دانەیەک دا ئەنێمەوە :

١ - ***قیس*** دەڵێ : عمر قاپێکی دا بە پیاوێک لە تەنیشتی بوو کاتێک خۆر ئاوا بوو ، پێی فەرموو : ڕەنگە لە دواخەران بیت لە بەربانگ کردنەوەتدا ، دواتر دواتر .

٢ - **موسى بن أنس** دەڵێ :

**أنس** رضي الله عنه کەنیزەکەکەی سەردەخست بەسەر سەربانی خانووەکە ، دەیفەرموو : ئەگەر ئاسۆ یەکسان بوو بانگم لێ بکە.

« هەواڵم پێ بدە ».

٣ - **عبد الرحمن بن حرملة** :

**لە سعید بن المسیب ەوە دەفەرمێ : ئەگەر بینیت عصر ت لێ ڕۆشت ئەوە بخۆرەوە .**

٤ - **الأعمش لە مسلم** ەوە ئەفەرمێ

ئەوان فەجر «بەیان» یان وەک ئەو فەجرەی ئێوە ئەژمار نەدەکرد ، ئەوان ئەو فەجرەیان ئەژمار دەکرد کە ماڵەکان و ڕێگاکانی پڕ دەکرد « واتە : هاوەڵان »

٥ - **عمرو بن حُریث** دەڵێ :

هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ : کەس هێندەی ئەوان پەلەی نەدەکرد لە بەربانگ کردنەوەدا و کەس هێندەی ئەوان لەسەر خۆو و هێواش نەبوو لە پارشێو کردندا .

٦ - **ابراهیم النخعي** ئەفەرمێ : ئەوان کاتێک کەسێک بە شەو بانگی بدابا ئەیانهێنا ئەیانفەرموو پێی : لە الله بترسە بانگەکەت بگێڕەوە .

هەروەها **ابراهيم النخعي** ئەفەرمێ :

ئەوان پێیان ناخۆش بانگ بدرێ پێش هەڵهاتنی بەیان .

**ووتم** : ئەم ریوایەتانە بەڵگەن بۆ هاندانی خەڵکی بۆ فێربوونی و ئاسایی سەیر کردنی باسەکە .

ب - کە ئەو دەڵێ تەنها چەند هاوەڵێک زانیویانە چییە ، باشە با بۆمان بهێنێ کە بزانین ئەو لەو هاوەڵانەی وەرگرتووە ؟

**واتە** : بۆ نمونە امام عمر و أبو بكر زانیوانە ، هیچ بەڵگەی تێدا نیە بۆ ئەوە بە گوێی ئەو بکەین و لەگەڵ ئەو کاتەی ئێستە دانراوە نوێژ و پارشێو بکەین ، ئێ ئەو لە امام أبو بكر و عمر ی وەر نەگرتووە قسەی گێرفانی خۆتە .

پاشان ئەگەر دەڵێ ئەو بۆمان دیاری دەکات ئێ ئەو سەرەتا ووتی هەموو هاوەڵانیش نەیانزانیوە ، واتە ئێستە ئەو خۆی لە زۆرێک لە هاوەڵان بە زاناتر دەزانێ و خۆی دەخاتە ڕیزی ئەوانەی کە زانیویانە.

## گومانی سێیەم : ئێستە ڕووناکیەکان و ناهێڵێن ڕووناکی فەجر دەربکەوێت وونی دەکەن لە چاو مرۆڤدا ،

**بە چەند شتێک وەڵام دەدەمەوە :**

١ - ئەوە قسەیەکە پێویستی بە سەلماندنە هەر بەو شێوەیە نابێت وا بوترێ و پاڵی لێ بدرێتەوە ، چونکە کە فەجر هات کاتێکی زۆر نابات تاوەکو ئاسمان ڕووناک دەبێتەوە وە هیچ شتێکیش نیە ڕێگری لە بینینی ڕووناکی ئاسمان بگرێ کاتێک دێت .

٢ - ئەم قسەیە بۆ فەجری کاذب نزیک ترە بووترێ ، چونکە فەجری کاذب وەک تیشکێک لە ئاسمانەوە ئاڕاستەی زەوی دەکرێ ، بەڵام فەجری صادق لەسەر شاخەکانەوە دەرئەکەوێ ڕاستەوخۆ نادات لە چاوی مرۆڤ تاوکو ڕووناکیەکانی لێ تێکە ببێت ، ڕووناکیەکی درێژ بە لەسەر شاخەکان دەردەکەوێ کە دوو ڕەنگ تێکەڵە و بە ئاسانی دەناسرێتەوە

٣ - الله جل جلالە ئەو ڕۆژەی ئەوەی کردە نیشانە بۆ ئەو شتە زانا بوو بەوەی ئەم ڕۆ ئەم شتە دێتە پێش لەگەڵ ئەوەیەک خطابی بەکار هێنا بۆ ئەوکات و ئێستەش ، فەرمووی « حتى يتبين لكم » ئەوە بۆ هەموو کەسێک لە شوێنی خۆی واتە نیشتەجێی کوێیە ئەوێ ئەژمار بکات بۆ هەڵهاتی فەجر لێیەوە، نەڕواتە شوێنێکی دیکە جگە لە شوێنەکەی خۆی کاتی هەڵهاتنی فەجر دیاری بکات بۆ شوێنەکەی خۆی کە لە شوێنێکی دیکە نیشتە جێ ئەبێ ، یاخود لە سەفەر ئەو شوێنەی کە لێی ئەحسێتەوە یاخود لەسەر ڕێگا لە کوێ بینی فەجری لێ هەڵهاتووە لەوێ خواردن و خواردنەوی لەسەر حەڕام ئەبێت وەک کردەوەکانی سەلەف بەڵگەن بۆ ئەمە .

**واتە** : ئەبێت فەجر بە ڕوون و ئاشکرایی لە ئێمە دەربکەوێ ، واتە : ئەو لە ئێمە دەربکەوێ نەک ئێمە لەو دەربکەوین ، بگەڕێین بە دوایدا .

٤ - ئەو کەسەی کە ئەمە ئەکاتە بەڵگە بەڵگەکەی یەقینی نیە بەڵکو ظني ە چونکە ئەو نازانێت هەڵهاتووە یاخود نا بەڵکو ئەو دەڵێ : ئەگەر هەڵهاتبێ ئێمە نازانین چونکە لە چاوی ئێمەوە دەرنەکوتووە گەرنا ڕەنگە دەرکەوتبێ ،

منیش دەڵێم الله ئەوەی بۆ داناوین تاوەکو ڕوون ڕوون لە ئێمەوە دەرنەکەوێت خواردن و خواردنەوەمان لەسەر حەڕام نابێت ،

ئەمەش هیچ کات نابێت کاری پێ بکرێت و یەقینی پێ هەڵبوەشێندرێتەوە چونکە خۆی گومانە وەک پێشتر باسمان کرد گومان دڵنایی لانابات و قسەی سەلەفمان هێنا پێشەوە بۆ سەلماندی ئەو قسەیە .

٥ - بەیانی ڕاستگۆ « فجر الصادق » سورایی تێکەڵی سپیایی بووە لە ژێرەوە سوورە و سەرەوە سپیە و سەرتر ڕەشی شەوە واتە سێ چینە ، بۆیە لێ تێکەڵ بوونی ئەوە بە ناوی زانست و بێ توانایی مرۆڤەوە زۆر دوورە .

٦ - وە ئەوەی کە دەکرێ « دیاری کردنی کاتێک بە هەمیشەیی » هیچ بنەمایەکی نیە و پێچەوانەی شەرع و واقعە بەڵکو هەر ڕۆژێک جیاوازە لە ڕۆژێکی دیکە ڕۆژانە گۆڕانی بەسەردا دێت .

٧ - وە ڕۆشتنە شوێنێکی دیکە بۆ دیاری کردنی کات و جێبەجێ کردنی بەسەر شوێنێکی دیکەدا بیدعەیە و هیچ بنەمایەکی شەرعی نیە بەڵکو الله فەرمانی کردووە بەوەی موسڵمانان لە شوێنی خۆیانەوە کاتی نوێژەکانیان دیاری بکەن نەک لە شوێنێکی دیکە کاتی بزانن و بەسەر شوێنێکی دیکەدا دایبەزێنن ، چونکە جیاوازی دروست ئەبێت و بەو جۆرەی الله فەرمانی کردووە تۆ کاتت دیاری نەکردووە.

**ئەوەش دوو وێنە ئاشکراو ڕوون کە زۆر بە جوانی فەجر تیایاندا دەرکەوتووە و ڕووناکیەکان نەبوونەتە ڕێگر لە بینینی :**






**بگەڕێوە بۆ ئەم دوو باسەی پێشتر:**

**( بۆ ئەوانەی لەسەر گومان واز لە خواردن و خواردنەوە ئەهێنن )**

**( وەڵامی پێشخستنی پارشێو بە ناوی احتیاط ەوە و سەلامەتی ڕۆژووە وە ، وە سوننەتی دواخستنی )**

بە هەمان شێوە لەبەر درێژ نەبوونەوەی باسەکە ریوایەتەکان جارێکی دیکە دانانێم.

## لە کۆتاییدا کورتەی باس :

ئاثار و فەرموودەی دیکە زۆر لەوە زیاتر بوون لە سەلەف و لە خەلەف ەوە بەڵام لەبەر درێژ بوونەوەی بابەتەکە بوو منیش نەمویست زۆر درێژ ببێتەوە وە هەندێکی دووبارە بوون لە هەندێک ڕووەوە بەڵام ئەوەندە بەسە پێم وابێت کە زۆر شت ڕوون دەکاتەوە بۆ هەندێک کە تاوەکو ئێستە نەیوێراوە قسەی تێدا بکات یان کاری پێ بکات بەمەش بەڵگەی نامێنێ لە لای الله کە نەیزانیوە و ترساوە لەوەی هەڵەبێت ئەو ڕێگەیە

پاشان ڕەنگە هەندێک بڵێن ئەم پێویست ناکات باس بکرێت یان فیتنە نانەوە بێت ، دەڵێم گەر کەسێک لە تەوحید و عەقیدە و سوننەت شارەزا بێت هەرگیز قسەی واناکات چونکە فەوتانی نوێژەکەی بەوەی کە زوو دەیکات و کاتی نوێژ هێشتا نەهاتووە  مەترسی لەسەر باوەڕی پەیدا دەبێت چونکە نوێژەکەی قەبوڵ نیە لە لای الله

وە جگە لەوەش ئێمە شوێنکەوتەی پێغەمبەرین ﷺ بە تێگەشتنی سەلەف و پەیڕەوی ڕێگەی ئەوانین و ئەوەی ئەوان بە دینیان زانی بێت و کاریان پێ کردبێ ئێمەش وا دەکەین وە لە درێژەی ئەم باسانەدا ڕوون بوویەوە بۆ هەموو لایەک کە زوو پارشێو کردن و درەنگ بەربانگ کردنەوە پێچەوانەی سوننەتە و بیدعەیە و الله پێی ڕازی نیە و پێغەمبەر ﷺ نەهی لێ کردووە و سەلەف دژایەتیان کردووە

وە گەر ئەوەش نەبێت تەنها ئەوەی کە زانیاریەکی زیادە بێت بۆ موسڵمانان و حەق ویستان کە باسەکە تەنها ئەوەندە نیە ئەوان دەیزانن بەسە بۆ ئەوەی کەسێک هەڵبستێ بە ڕوونکردنەوەی ئەمە جا من بم یان هەر کەسێکی دیکە بێت.

## پاشان ووتەی کۆتایی :

جا گەر هەرکەس ووتەی الطبري مان بۆ بهێنێتەوە لەبەرامبەردا لەگەڵ ووتەی عبد الرحمن بن زيد بن أسلم السدي کە تەرجیحی داوە دەربارەی کاتەکە و قسەکردن لەسەر هەندێ فەرمووده ، کە من لێرە لەبەر درێژی و بێ پێویستی نایهێنم

ئەوە لە وەڵامدا دەڵێم : ئێمەش ناڵێین تاوەکو دنیا ڕووناک ئەبێتەوەهەر ئەتوانی خواردن و خواردنەوە بخۆیت ، بەڵکو ئەڵێین ئەبێ فەجر دەربکەوێ ئینجا دەست هەڵبگری لە خوارد و خواردنەوە هتد.. هەروەک عبد الرحمن بن زيد بن أسلم بە ڕاشکاوی ووتی و ابن جرير الطبري بە راجحی ئەزانێ ئەگەر چی جیاوازی هەیە بگرە هەندێک پێیان وایە تاوەکو هەڵهاتنی خۆر دروستە بەڵام دوورە الله أعلم وە بەڵگەیەکی وای لەسەر نیە بەڵام بێگومان ئەبێت خۆر هەڵبێت ئەنجا کاتی نوێژە.

نەمانوتووە دونیا تەواو ڕووناک بکات بەڵام ناشڵێین بە تاریکی شەو کە هێشتا فەجر هەڵنەهاتووە ، بە هەمان شێوە بۆ ئێوارە و بەربانگ پێش خۆرئاوا بوون بە کاتی بەربانگی نازانین وە نایخەینە شەویش هەوا تاریک بووبێت ، لە هەردووکیدا ناوەندیگیریەک هەڵدەبژێرین بە شێوەیەک کە مەنهەجی سەلەف لەسەری جێگیر بووە.

**وآخر دعوانا أن الحمدلله رب العالمين.**

**٢٩ / ٥ / ٢٠٢١ ز - شەممە**

**١٧ / شوال / ١٤٤٢ کۆچی**

**بدر خورماڵی**

# سەرچاوەکان

صحيح البخاري - صحيح المسلم - سنن الترمذي .

١ - جامع البيان في تفسير آي القرآن لمحمد بن جرير الطبري « ت ٣١٠ هـ » ، ت : عبد الله التركي و مركز البحوث و الدراسات ، طبعة دار الهجرة - الأولى ٢٠٠١ م .

٢ - مصنف ابن أبي شيبة ، ت: حمد بن عبد الله الجمعة - محمد بن إبراهيم اللحيدان. مكتبة الرشد - الطبعة الأولى .

٣ - سنن الدارقطني ، ت : الشيخ عادل أحمد عبد الموجود و الشيخ علي محمد معوض - دار المعرفة : طبعة الأولى ، ٢٠٠١ .

٤ - مسائل الامام أحمد رواية ابنه صالح ، تحقيق: د . فضل الرحمن دين محمد - دار العلمية - الطبعة الأولى ١٩٨٨ .

٥ - فتح الباري لابن رجب الحنبلي ، تحقيق أبو معاذ طارق بن عوض الله محمد - دار ابن الجوزي - الطبعة الأولى ١٩٩٦.

٦ - كتاب شرح صحيح البخاري لابن حجر العسقلاني ، ت : عبد العزيز بن باز ، محمد فؤاد عبد الباقي ، محب الدين الخطيب ، مطبعة السلفية و مكتبتها - الطبعة الأولى .

٧ - سنن سعيد بن منصور ، ت : سعد بن عبد الله الحميد ، دار الألوكة - الطبعة الأولى ٢٠١٢ .

٨ - تفسير مقاتل بن سليمان ، ت : د . عبد الله شحاتة ، مؤسسة التاريخ العربي - الطبعة الأولى ٢٠٠٢.

٩ - تفسير ابن أبي زمنين ، ت : أبي عبد الله حسين بن عكاشة ، محمد بن مصطفى الكنز - الفاروق الحديثية للطباعة والنشر - الطبعة الأولى ٢٠٠٢.

١٠ - تفسير الهداية إلى بلوغ النهاية لمكي بن أبي طالب ، كلية دراسات العليا و البحث العلمي ، جامعة الشارقة - الطبعة الأولى ٢٠٠٨ .

١١ - مصنف عبد الرزاق الصنعاني ، ت : مركز البحوث و التنقية المعلومات ، دار التأصيل الطبعة الأولى ٢٠١٥.

١٢ - المغني لابن قدامة المقدسي ، ت : عبد الله بن عبد المحسن التركي ، عبد الفتاح محمد الحلو - دار عالم الكتب - الطبعة الثالثة.